رێکخراوی سابات بەهاوکاری USIP

# ژن و هوشیاری سیاسی



ئامادەکردنی

شادیە حەسەنو سەروەر کەریم

2006

٭کتێب: ژنو هوشیاری سیاسی

٭ئامادەکردن: شادیە حەسەن - سەروەر کەریم

٭تیراژ: 1000 نوسخە

٭ساڵی چاپ: 2006

٭دیزاین: سەلام مارف

٭لەبڵاوکراوەکانی رێکخراوی سابات

## پێرست

# پێشەکی

ئەم نامیلکەیەی بریتیەلە کۆمەڵێك بابەتی تایبەتی لەبارەی (ژن وسیاسەت، مافەکانی ژنان،مافەبنەڕەتیەکانی مرۆڤو مافەمەدەنی وسیاسیەکان، توندوتیژی دژی ژنان، نەریتە کۆمەڵایەتیەخراپەکانو پێشێل کردنی مافەکانی ژنان، دیموکراسیو مافی ژنان)، کەرێکخراوی سابات بەهاوکاری (USIP)، لەچوارچێوەی چەند وۆرك شۆپێك دا و لەناو شاری کەرکوكو لەچەند هۆڵێکی جیاواز وتراوەتەوە، کەهەر یەکێك لەو بابەتانە گرنگی تایبەتمەندی خۆی هەبوەو بوەتە شوێنی گفتوگۆو وروژاندنی چەندین پرسیاری جۆراوجۆر لەبارەی ئەو بابەتانەوە. کەزینویەتیەکی زۆری بە وۆرك شۆپەکان بەخشی. چونکە ئەم کارانە، لەشاری کەرکوکدا گرنگی خۆی هەیە. لەبەر ئەوەی ئەو شارە بەدرێژای مێژووی حکومەتە یەك لەدوای یەکەکان دوچاری گەورەترین چەوساندنەوەی ئایینیو نەتەوەیی وڕەگەزی هاتوون، جگەلەوەی هیچکات بواری ئەوەیان نەدراوە بەئازادی گوزارشت لەمافو ئازادیەکانی خۆیان بکەن، ئەمەکاریگەری خراپی لەسەر کەسێتیو سایکۆلۆژیەتیان داناوەو. زۆرجاردووچاری ڕەش بینی کردون بەگۆڕانکاری لەژیانو



مافەکانیان. بۆیەبەردەوام لەژیانێکی پڕلەقەلەقی داژیاونو کراونەتە قوربانی دەرەوەی خواستەکانی خۆیان. لەهەلومەرجێکی لەوجۆرەدا، دەبێت ژنان چۆن ژیانیان گوزەراندبێت، چونکە لەتەواوی کۆمەڵگادواکەوتوەکاندا ژنان پلەیەك لەخوارپیاوانەوەنو ئەمەش ئایینەکان بەسەرژناندا سەپاندویانە دواتر لەدەستووروپاساکاندا ڕەنگی داوەتەوەو بووەتە قانونی گۆمەڵگاو کاری پێکراو، بەمانایەکی تربوەتە عەقلیەتیو فەرهەنگی کۆمەڵگاو نەوەدوای نەوەدرێژەی کێشاوە. هەموودەسەڵاتەکانی دوای دامەزراندنی دەسەڵاتی ئایین پەنایان بۆکۆیلەکرندنی ژنان بردوەو ئەمەشیان بەستوەتەوە بەوەی کەژنان زەعیفەن کەم عەقڵن ... هتد. لەگەڵ ئەوەی ژنان لەلای ئەم جۆرەدەسەڵاتانە تەنها ئامێرێك بووە بۆمنداڵ بوون ولەزەتی سێکسی. بۆیە کاتێك دەستوورەکان دێنەبوون کۆی چەوساندنەوەی ژنان لەناویدا پۆڵێن ئەمەشیان بەستوەتەوە بەئەفسانەی (ئادەم _ حەوا) وە.کەگوایە بەپێی ئەفسانەکە یەکەمین کەسێك کەسەرپێچی لەفەرمانی خواوەند کردوە ئادەم بووە ،بۆیە خواوەندیش نەفرەتی لێکردوە. بەدوای خواوەندیش پیاوانی ئایین بۆبەرژەوەندیەکانی خۆیان وتێرکردنی ئارەزوە سێکسیەکان .چەندین سانسۆر دسپلینیان بۆڕامکردنی ژنان داناو ئامۆژگاری ژنانیان بەوەدەکرد کەنابێت بەهیچ شێوەیەك لەفەرمانەکانی پیاوان دەربچن، چونکە خودا پیاو لەژن بەگەورەتر دروست کردوە. ئەم سیستمە دەچەوساندنەوەی ژنان لەکۆی دەسەڵاتەکانی ئایین جێبەجێ کراوە بەزیاتریشەوە. ئەوەش ئەوو نەگبەتیە بووکەبەدرێژایی دەسەڵاتی ئایین بۆژنان بەدیاری هاتوەو تائێستاش لەبەشێکی زۆرلەووڵاتانی دنیا

ئەوسیستمە بە سەرژناندا جێ بەجێ دەکرێت ملیۆنان ژن بەدەست سیستم دەسەڵاتی ئایینیەوە دەناڵێنن، کەئەوسیستمانە هەرگیز ژن وەك مرۆڤ سەیرناکەو لەهەموومافێکی ئینسانی دایانبڕیوە. تائێستاش لەکۆمەڵگا ئایینیەکاندا ژن پلەیەك لەخوار پیاوەوەیەو ژن بۆی نیە لەفەرمانەکانی پیاو دەربچێت چونکە گەورەترین سزای لەسەر کەئەویش کوشتنە، لەگەڵ ئەوەی ژن لەم دەسەڵاتانەدا بەشەرەفی خێزان بنەماڵە دادەنرێت وهەمیشە پەرژینێکیان بەدەوردا کێشاوە، بۆیەژنان بەردەوام دووچاری گەورەترین ئازار بوون. ئەوەگەورەترین سیمای کۆمەڵگای سونەتیە. بەهەرحاڵ ڕێخراوی سابات بەهەمووئەوگرفتانەی لەکۆمەڵگای کوردی دا بوونی هەیە دەستی بەکارێك کردووە لەخزمەتی ژنانی کەرکوك وهۆشیاریان. کەدەکرێ لەداهاتوودا ئاکامێکی باشی هەبێت، لەخزمەتی ژنان دا .

کارکردنی ڕێکخراوی سابات بۆهۆشیارکردنەوەی ژنان لەئێستادا گرنگی تایبەت مەندی خۆی هەیەوناکرێ بەچاوێکی ساناسەیری ئەوکارەبکرێ، چونکە شاری کەرکوك هەڵگری دنیایەك کێشەو گرفتی جۆراو جۆری خۆیەتی. لەڕووی ئابوری وکۆمەڵایەتی خێزانی بنەماڵەییو خێزانیەوە، کۆی ئەوبابەتانەی لەکەرکوك دا پێشکەش بەژنان دەکرێن بۆردی خۆی هەیەو کاریگەری ئیجابی هەیە، وەك لەپێشتر ئاماژەمان بۆکرد ئەوشارە بەدرێژایی مێژوو دووچاری زووڵم هاتووە. ئەوەش ڕەنگی داوەتەوە لەسەر سایکۆلۆژیەتی کۆی تاکەکانیو کاری گەری ئایین یش لەولاوەبوەستێ کەچی بەعەقڵیەتی تاکەکان کردوە. بۆیە دەبینن خەڵکی ئەوشارە لەهەموو ڕوویەکەوە دووچاری



تێك شکان هاتوون نتوانن لەئاست کێشەو گرفت مافەکانیان بن ئایین زوڵمی خۆی کردوە ،پیاوان بەناووی ئایینەوە زووڵمی خۆیان کردوە ... هتد، ئەم هەموو زووڵمە وای کردووە کەژنان تائەوپەڕی سڵ لەهەموو مافو ئازادیەکانی خۆیان بکەنەوە بەناوی ترس لەسەرپێچی فەرمانەکانی خواوەند، ئەوە تائەو پەڕی بێمافی سوکایەتیە بەژنان، ڕێکخراوی سابات لەچوار چێوەی ئەوکارەی داو بۆ ڕەواندنەوەی ئەو توندوتیژیەی سەرژنان هۆشیارکردنەوەیان بەماف ئازادیەکان، لەڕووی کۆمەڵایەتی ویاسایی ودەستووری ... هتد، هەوڵی داوە لەچوارچێوەی کارەکانی دا لەپێناو خزمەت کردن بەژنانی کەرکوك ومافەکانیان تائەئ پەڕی کاری جدی بکات ئاوڕێك لەژنانی ئەو شارە بداتەوە هەنگاوێك بەرەو باشکردنی ژیانی ژنان بنێت. ئەم پڕۆژە نوێیەی ڕێکخراوی سابات کەچەندین وۆرك شۆپی لەخۆگرتبو ماوەی چەندمانگێکی خایاند (110) سەدو دە کەس لەنوێنەری ڕێکخراوەکانی ژنانو ڕێکخراوە مەدەنییەکان ئامادەی بوون گفتوگۆیەکی جدیان لەبارەی بابەتەکانەوە دەکرد کەلەم نامیلکەیەدا هەوڵ دەدەین لەبەشی کۆتایی دا بەشێك لەقسەکانی بەشداربوان بکەینە پاشکۆی کورتەیەك لەسەربابەتەکان. بەهەر حاڵ ئەم نامیلکەیە کورتەیەکی بابەتی ئەو وانە بێژانەیە کەوانەیان پێشکەش بەگروپەکان کردوە، کە وانەکانیش بریتی بوون لە (48) وانەو، هەر وانەیەکیش سێ کاتژمێری خایاند.

سەروەرکەریم

# تێڕوانینێك سەبارەت بەتوندوتیژی هۆكارو دەرئەنجامەكانی



یەكێك لەو چەمكانەی زۆرێك لەتیۆرستە كۆمەڵایەتیو دەروناسەكانی بەخۆیەوە سەرقاڵكردوە، چەمكی توندوتیژیە، ئێمە دەزانین ئەم چەمكە چەندێك دەرئەنجامی ترسناكی لێدەكەوێتەوە، باسەرەتا بپرسین توندوتیژی چییە؟، ئالێرەدا لەگەڵ ئاستەنگیەكی گەورەدا بەرەو ڕوو دەبینەوە، لەبەر ئەوەی هەر كۆمەڵگایەك بەپێی تێڕوانینی خۆی تەماشای توندوتیژی دەكات، بەڵام دەتوانین بڵێین، هەر كردارێك ببێتە هۆی ئازاری جەستەیی یان دەروونی بەتوندوتیژی ئەژمار دەكرێت، بەڵام ئایا توندوتیژی سیفەتێكی سروشتی هەیە یان حاڵەتێكە مرۆڤ بەپێی مومارەسەكردنی ژیان دەستی دەكەوێت، بۆ زانینی وەڵامی پرسیارێكی لەو جۆرە، دەبێت پەنا بۆ مێژوی مرۆڤایەتی بەرین، كەچۆن توندوتیژی بۆ مەبەستی تایبەتی خۆی داناوە، هەندێك لەبیریارەكانی بواری توندوتیژی رایان وایە توندوتیژی بەشێكی دانەبڕاوی سروشتی مرۆڤایەتییە، ئەم مەیلە توندە وای لێدەكات لەگەڵ كەسانی تردا بەشەڕ بێت، ئەگەر تەماشای دەوروبەری خۆمان بكەین، چەندەها جۆرو شێوەی توندوتیژیمان بەر چاو دەكەوێت، هەرهەموو بەشێكە لەو بیركردنەوە كەلتوریەی ئێمە، كەبەشێك لەبیركردنەوەی ئاینی ئێمە توندوتیژی بۆ ئەوە دەگێڕنەوە، كەمرۆڤ لەبەرئەنجامی

گوناهی خۆیەوە توشی ئەو سزایە هاتووە، بەر لەوەی بچینە سەر باسەکەمان، باهەندێك لەپێناسەکانی توندوتیژی بەنمونە بهێنینەوە.

### توندوتیژی

ئەم چەمکە بەچەندین شێوەو مانای جیاجیا پێناسە کراوە، بەتایبەتی لەلایەن کۆمەڵێك تیۆریستەوە، ئەمەش هەندێکن لە پێناسەکان.

عبدالوهاب(2000):

ئاکارو کردارێکە, هەلگری سیفەتێکی دوژمنکارانەیە, لەلایەنێکەوە دەردەچێت, لەوانەیە تاکە کەس یان کۆمەڵێك کەس, یان دەوڵەت بێت, مەبەست لێی ملکەچ پێکردنو بەکارهێنانی لایەنی بەرامبەرە, ئەویش لەپەیوەندیەکی نابەرابەر, لەڕووی ئابوری یان کۆمەڵایەتی یان سیاسیەوە, کە دەبێتە هۆی زیانی مادی یان مەعنەوی یان دەروونی تاك یان کۆمەڵ یان دەوڵەتێکی تر(عبدالوهاب,2000: 16).

هیسنارد (1997):

توندوتیژی وەك هەموو شێوازەکانی تری رەفتار، دەرئەنجامی ئەو تەنگژەو ڕێگرییەیە، کەدەبێتە هۆی تێکشکاندنی خودی ئەو کەسەو بەسەر ئەوی تردا دەیرپێژێتو لەناوی دەبات، بەمەش شەرانگێزی دەبێتە شێوازێکی دیاریکراو، لەپەیوەندی بەوی ترەوە(.شکور،1997: 32).

شتراوس (1997):



وەڵامدانەوەی وورووژێنەرێکی دەرەکییە، کە ئازار بەکەسێکی تر دەگەیەنێت، وەڵامدانەوەی کاری توندوتیژی، بارگاوییە بەهەڵچون توڕەیی‌و خرۆشان‌و شەرانگێزی (هەمان سەرچاوە:ل 32).

میلز(1992):

هەموو سیاسەتێك، جۆرێکە لە کێشمەکێش لەپێناو دەسەڵاتدا، توندوتیژیش دوا پلەی دەسەڵاتە(أرندت، 1992: 31).

ئەرەندت (1992):

توندوتیژی کارێکە، لەدەرئەنجامی تووڕەییەوە دەبێت، ئەو مەسەلەیەی هەمووان لەسەری کۆکن، توندوتیژییە، لەوانەیە ببێتە حاڵەتێکی نائەقڵانی‌و نەخۆشی، بەڵام ئایا ئەمەحاڵی هەموو سۆزە مرۆییەکان نییە؟( هەمان سەرچاوە: ل56)

دەتوانین بڵێین، کۆمەڵێك هۆکاری تایبەتی لەناو چوارچێوەی کۆمەڵگادا هەن توندوتیژی‌و قەبارەی توندوتیژی دیاری دەکەن, کەئەوان دەبن بەپێوانەی ئەوەی, کەچی توندوتیژییەو چی توندوتیژی نییە, زۆر جار هەندێك ئەوەی لەپێناسە تیۆریەکاندا وەتوندوتیژی دەناسرێنرێت, لەناو کایەیەی کۆمەڵایەتیدا بە توندوتیژی حسابی بۆ ناکرێت, بەڵام ئەوەمان بیر نەچێت توندوتیژی دوا زمانی قسەکردنە بۆ گەیشتن بەو ئامانجە نادروستانەی مرۆڤی خۆپەرست بەدوایدا وێڵە, هەندیك لە بیریاران بەو ئاکارەی دەناسێنن, کەوەڵامدەرەوەی ورووژێنەرێکی دەرەکیە, کەئازار بەبەرامبەرەکەی دەگەیەنێتو پرپەتی لە هەڵچونی دەروونی‌و توڕەیی‌و بەرەنگاربوونەوە,

کەهۆکارە سەرەکیەکەی بۆ نوشستی (الاحباط) دەروونی دەگەڕێتەوە, کەلەئەنجامی کۆنترۆڵەوە ئەم حاڵەتە پەیدا دەبێت.

**توندوتیژی دژی ژنان**

یەکێك لەو چەمکانەی پێناسەکردنی ئاسان نییە,توندوتیژیە دژی ژنان, کە چەندەها شێوازی جیاجیا لەخۆ دەگرێت لێرەدا هەندێك پێناسەی توندوتیژی دژی ژنان دەکەین

عبدالوهاب( 2000)

ئەو ئاکارو کردارەیە، کە لەدژی ژن ئاراستە دەکرێت، جا ئەگەر ژن یان دایك یان خوشك یان کچ، بێت، کەخاوەنی پلەی جیاوازی جیاکاریی‌و چەوسانەوەو نەهامەتی‌و دوژمنکارانەیە، کە لەپەیوەندییەکی نابەرابەری نێوان ژن‌و پیاودا هەیە

( عبدالوهاب،2000: 20).

نەتەوە یەکگرتووەکان (2001)

ئەو توندوتیژییەی، لەدژی ژنان ئاراستە کراوە، بەهۆی ئەوەوە کەئافرەتە،یان ئەو توندوتیژیەی کەبەناڕەوا لەگەڵ ئافرەت دەکرێت‌و ئەو کردارانەی، کەزیان یان ئازاری جەستەیی‌و ئەقڵی‌و سێکسی پێبگات، بەو کارانەش هەڕەشەی لێبکات‌و ناچاری بکات، هەروەها بەکارهێنانی هەموو شێوەیەکی زەوتکردنی ئازادی، پێشلکارییەکی هەموو ئەو مافانەیە کەهەیەتی‌و لەسەر ئاستی نێودەوڵتی دانیپێدانراوە(نەتەوە یەکگرتوەکان، 2001: 40)

سمالوگی(2003)



لێسەندنەوەی مافی ژنە لەهەموو بوارەکاندا، وەك مافی سیاسی‌و ئابووری‌وفەرهەنگی، هەروەها وەك مرۆڤێکی پلە دوو تەماشای دەکرێت‌و لەپیاوان کەم تواناترن.

مەحمود(2002):

توندوتیژی دژی ژنان، لەلایەن کەسێك یان کۆمەڵێك یان دەزگایەکەوە بێت بەشێوەیەکی بەرنامە بۆ داڕێژراو یان نارێك، کە ئەویش دیاردەیەکی جیهانییە، هەروەها هەڕەشەکردن یان بەزۆر کارپێکردن یان بێبەشکردنی نامرۆییانە لە ئازادییەکان، ئیتر ئەگەر ئەوە لەسەر ژیانی تایبەتی یان گشتی بێت.( مەحمود،2002: 20)

**توندوتیژی خێزانی**

عبدالوهاب( 2000)

دەتوانین بڵێین ئەمیش بەهەمان شێوە بە ئاکارو کرداری دوژمنکارانە دابنێین, کە لەپەیوەندیەکی ناهاوسەنگەوە دەردەچێت, ئەویش لەچوارچێوەی سستمی دابەشکردنی کار لەنێوان ژن‌و پیاو, لەخێزاندا, ئەگەرچی لەچوارچێوەی خێزانی ناوەکی خۆرئاواییدا توندوتیژی دەکەوێتە نێوان ژن‌و پیاوەوە, بەڵام لەکۆمەڵگای ئێمەدا, کەچەندەها ئاستی جیاوازی لەشێوەی خێزاندا تێدایە, شێوازی توندوتیژی خێزانی تەنها, لەنێوان ژن‌و پیاودا روو نادات, بەڵکو بۆ ئاستی منداڵ‌و دایك‌و خوشك‌و کچیش درێژ دەبێتەوە(عبدالوهاب,2000: 19)،

دلتافۆ(2002)

ناتوانین مێژووی جیهان‌و چیرۆکی توندوتیژی خێزانی، لەیەکتر جیابکەینەوە، چونکە ژن لەهەموو جیهاندا، لەلایەن هاوسەرەکانیانەوە تووشی لێدان دەبن، جا جیاوازی زمان، ئایین، داب‌و نەریتی نێوان کۆمەڵگاکان هەر چۆنێك بێت(دلتاڤۆ، 2002: 7).

سنیورە(2003):

مانای لێدان‌و سوکایەتی پێکردنی ئەنقەستی ژن‌و منالە، لاقەکردنی هەموو تابۆکانی ژنە لەخێزاندا,ئەم کارە لەلایەن مێرد، کوڕ، برا، باوکەوە دەکرێت، لەبەرئەوەی پیاو لەکۆمەڵگای باوکسالاریدا خاوەنی پێگەو دەسەڵاتی خۆیەتی، ئەم کارە دەسەڵاتی پیاوی بەسەر ژندا زیاد کردووە، بەهۆی بەکارهێنانی توندوتیژییەوە ئەم دەسەڵاتە دەسەپێنێت(سنیۆرە، 2003: 2)

نەتەوە یەکگرتوەکان(1993):

ئەو توندوتیژییە جەستەیی‌و سێکسی‌و دەروونیەیە، لەچوارچێوەی خێزاندا ڕوو دەدات، لەوانە لێدان‌و دەستدرێژی سێکسی بۆسەر منالآنی مێینەی خێزان یان ئەو توندوتیژیەیەی پەیوەندی بەمارەییەوە هەیە، یان لاقەکردنی ژن لەلایەن مێردەوە، خەتەنەکردنی کچان‌و چەندەها مومارەسکردنی تەقلیدی ئازار بەخش بەژنان( نەتەوە یەکگرتووەکان، 1993: 2).

واتە دەتوانین باس لەچەندەها شێوازی توندوتیژی خێزانی بکەین, کەلە کۆمەڵگای ئێمەدا ڕوودەدەن, لەبەر ئەوە پێویستە لەو چوارچێوە کۆمەڵایەتییەدا ئەو چەمکانە باس لێوە بکەین, کە پەیوەندیان بەمەسەلە خێزانیەکانەوە هەیە،



ئەمانە کۆمەڵێك پێناسەی جیاجیای توندوتیژین، لەم پێناسانەوە دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی پێویستە کارێك بکەین توندوتیژی لەهەموو ئەو توخمە ئەزەلی‌و ئەبەدییانەی پێوەی لکێنراوە جیا بکەینەوە، ئەبێت کار لەسەر ئەوە بکەین چۆن توندوتیژی وەك چەمك‌و مومارەسە، بناسێنین‌و ئەوەش ڕوون بکەینەوە، توندوتیژی زیاتر حاڵەتێکی دەستکردە نەك بەشێك بێت لەسروشتی مرۆڤایەتی.

ئەگەر تەماشای دەوروبەری خۆمان بکەین، هەست دەکەین شێوەکانی توندوتیژی گۆرانی بەرچاوی بەخۆیەوە بینیەوە، لەوانە زیاد بوونی ژمارەی ئەو ژنانەی بەناوی سڕینەوەی لەکەی شەرەفەوەدەکوژرێن ڕوو لەزیاد بوونن، هەروەها ژمارەی ئەو ژنانەی لەتاو توندوتیژی خێزانی خۆیان دەسوتێنن زۆر ڕوو لەزیاد بوونن، لەبەر ئەوە دەکرێت بەشێوەیەکی جیاوازتر لەو مەسەلەیە بڕوانین، کەئەم جۆرە لەتوندوتیژی تەنها پەیوەندی بەبنەما تەقلیدیەکانی یان بیروڕاکانی کۆمەڵەوە نییە، بەڵکو بەشێکی بۆ پێکهاتە نوێیەکانی ناو کۆمەڵگای ئێمە دەگەرێتەوە، ئەو کۆمەڵگایەی لەنێوان کۆن‌و نوێدا جێگیرنەبووە، لەبەر ئەوە دەتوانین بڵێین توندوتیژی ئێمە بۆ جیهانێك دەگەرێتەوە، سەر بەڕۆژگاری ئەمرۆمانە، سەر بەو هەموو جەنگەیە کەئێمە لەناو خۆماندا مومارەسەی دەکەین، سەر بەو ڕقەیەو کەبەناوی پیرۆزیەوە بەرامبەرمان دەکرێت، یەکێك لەو جۆرانەی توندوتیژی، کەدەمانەوێت هەڵوێستەی لەسەر بکەین، توندوتیژی خێزانییە، کەئەمرۆکە بەشێوەو پێکهاتەی جیاواز لەناو کۆمەڵگاکانی دنیادا بوونی هەیە، واتە کۆمەڵگایەك نییە ئەم جۆرەی لەتوندوتیژی تێدا مومارەسە نەکرێت،

بەڵام ئەم کارە لەسەر ئاستی یاساو کۆمەڵگا، جیاوازی لەنێوانیاندا هەیە، ئەگەر تەماشای بیرکردنەوەی خۆمان بکەین، دەبینین چۆن تاماوەیەکیش لەمەوبەر ئەم جۆرە کارەیان بەتوندوتیژی ناودێر نەدەکرد، بەڵام ئەمڕۆ بەهۆی سەرهەڵدانی هەندێك ڕێکخراوی تایبەتو بیرکردنەوەی ڕۆشنبیریانە، ئەم کارە خەریکە لەسەر ئاستی کۆمەڵایەتی وەك جۆرێك لەپێشلکاری مافی ژن تەماشای دەکرێت، گۆرینی ئەم بیرکردنەوە میللیە سەبارەت بەتوندوتیژی ئەو مافەمان دەداتێ بڵێین خەریکە کۆمەڵگای ئێمەش لەسەر ئاستی کۆمەڵایەتیو یاسایش بیر لەدۆزینەوەی ڕێگاچارەیەك بۆ ڕێگرتن لەم مەسەلەیە دەدۆزنەوە، هەموو ئەمانە وامان لێدەکەن بەم بارە نوێیە شادمان بین، هەروەها دڵخۆش بەرامبەر بەو هەموو حاڵەتەی وەك ئەوەی مژدە بەسەردەمێکی نوێ بدات، کەچیدی توندوتیژی خێزانی تەنها کارێك نییە پەیوەندی بەناوخۆی خێزانەوە بێت، بەڵکو مەسەلەیەکی کۆمەڵایەتییەو لەسەر ئاستی یاسا لێپرسینەوەی لەسەر دەکرێت، سەرەتا بابپرسین توندو تیژی خێزانی چۆن سەرهەڵدەدات؟.

لێرەدا هەندێك هۆکاری دەرکەوتنی توندوتیژی خێزانیتان بۆ باس دەکەم، بەتایبەتی ئەوەی لەناو کۆمەڵگای ئێمەدا بەربڵاوەو کاری پێدەکرێت، هۆکاری سەرەکی بۆ توندوتیژی خێزانی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، لەبنەمادا ئەو خێزانە لەسەر بنەمای خۆشەویستیو لێکتێگەیشتن دروست نەبووە، بەڵکو لەسەر ئەو بنەما میللیە دروست بووە، کەدەڵێت کوڕ ئەبێت ژن بێنێتو کچیش دەبێت هەر شووبکات، ئەمەش وای کردووە توندوتیژی لەناو ئەو سستمەی هاوسەرێتیدا وەك



کاردانەوەیەکی تەواو بەکار بهێنرێت، هەر ئەم بنەمایە وادەکات ژنو پیاو پێکەوە نەگونجێن، لێرەوە لێدان دەبێتە ئەو سەرچاوەیەی پیاو بۆ کۆنترۆڵکردنی ژنەکەی بیگرێتە بەر، ئەو هەموو لێدانەی لەنێوان ژنو مێردا ڕوودەدات، هۆکارەکەی بۆ ئەم لەیەکتر تێنەگیشتنە دەگەڕێتەوە، بەڵام ئەوەی لەهەمووی قەباعەتترە، یاسای ئەم وڵاتەیە، کەبەئاشکرا ڕێگا بەم جۆرە توندوتیژیە دەداتو بەپێشلکاری یان تاوانێکی یاسایی نازانێت، بەڵکو وەك مافێکی ڕەوای پیاو بەسەر ژنەوە تەماشای دەکات، لەبەر ئەوەیە پیاوی ئێمەو کوڕانی خێزان ئەو ڕێگەیە بەخۆیان دەدەن لەژنو منداڵو خوشكو دایکیان بدەن، هەمووان دەزانین ئەم هەڵسو کەوتە ناشرینترینو خراپترین جۆری ئاکاری نامۆرییە دژ بە دەورو بەرمان ڕوودەدات، تەنانەت لێدان بووەتە بارێکی ئاسایی مامەڵە لەگەڵ یەکتردا کردن، ئەمە جگە لەوەی هەندێك جار توندوتیژی دەگاتە کوشتنو تیرۆرو ئەتککردن، لەکاتێدا ئەم کارە دەکەین ئەو هەستەشمان لاڕوونە، کەئاشکرایە توندوتیژی جگە لەرقو گەورەکردنی کێشەکان هیچی تری بەدوادا نایەت، بەڵام ئەم کارە بۆ دەکەین؟، ئێمەش لەگەڵ ئەو بیرو باوەڕەدا کۆکین، کەهاوسەرێتی بنەمای بەردەوامی ژیانی هەموومانە، پێگەیەکە بۆ گەشەسەندنی کۆمەڵگا، ڕاستە لەوانەیە ئێمە بۆخۆمان لەگەڵ ئەم جۆرە بیرکردنەوەیەدا بین، بەڵام بەهەمان مەرجی کۆمەڵایەتی ئێستا نا، بەڵکو  پێویستە بەشێوەیەکی تر بیر لەم کارە بکەینەوە، وەك پەیوەندیەکی زۆر کەسی تەمشای بکەین، کەمرۆڤەکان لەدیاریکردنی چارەنوسو هاوسەری ئایندەیان ئازاد بن، ئەمە جگە لەوەی هەرکات ئەو دوو مرۆڤە ئەگەر بەیەکەوە نەگونجان، لەبری

بەکارهێنانی توندوتیژیو لێدانو کوشتن، بارێگای جیابوونەوە بگرنە بەر، نەك ئەوەی ژیانیان وەك دۆزەخ وابێتو نەشتوانن لەبەر تانوتی کۆمەڵگا لەیەکتری جیا ببنەوە، بەر لەوەی بچینە ناو ئەم شیکردنەوە کۆمەڵایەتییە ئاڵۆزەوە، بێن قسە لەسەر ئەو هەموو تێڕوانینە کۆمەڵایەتییە بکەین، کەئێمە بەنیازین شیکردنەوەی بۆ بکەین، بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندی بەمەسەلەی ژنەوە هەیە، ئەگەر تەماشای پێکهاتەی کۆمەڵایەتی خۆمان بکەین، کەمێك بەوردی تەماشای بیرکردنەوەی کۆمەڵایەتی بکەین بۆمان ئاشکرا دەبێت، کەتاکو ئێستا ئێمە ژن وەك بوونەوەرێکی کەم ئەقڵ تەماشا دەکەین، لەوانەیە بپرسن چۆن؟، ئاسانە، ئەگەر لەخێزانێکی ناو کۆمەڵگای خۆمان ورد ببینەوە، دەبینین چۆن تەماشای ژن دەکرێت، کەئەگەر ئەو ژنە چەندیش بەتەمەن بێت، ئەوا کەمتر لەمەسەلە گرنگەکانی خێزاندا بیروڕای وەردەگیرێت، یان لەکاتی میوانداریدا ژنەکان لەچاوی میوانە پیاوەکان دوور دەخرێنەوە، وەك ئەوەی ئەمان سەرچاوەی گوناه بن، لەبەر ئەوە ناکرێت ئەم تاوانکارانە بێنە ناو ئەو مەجلیسەی پیاوان راوشکاریو کاری گەورەی تێدا دەکەن، ئەو کارەی تەنها پەیوەندی بەپیاوەوە هەیە نەك ژن. لێرەدا مەسەلەکە تەنها پەیوەندی بە تەمەنەوە نییە، بەڵکو پەیوەندی بە پێگەی ژنەوە هەیە لەناو کۆمەڵگای ئێمەدا, ئەگەر کەمێك بەوردی تەماشای دەوروبەری خۆمان بکەین، دەبینین زیاتر رای کوڕ لەهەندێك مەسەلەی گرنگدا وەردەگیرێت، بەڵام ئەم کارە بۆ کچ بەجۆرێك لەشورەیی تەماشای دەکرێت، تەنانەت کەدێتە سەر ئەوەی چۆن بڕیار لەسەر چارەنوسی کچێك بدەن، دوا پرسیار لەکچەکە



دەکرێت، هەندێك جار ئەگەر ژن یان کچ بیروڕای خۆی لەسەر مەسەلەیەك بدات، ئەگەر لێینەدرێت بەدڵنیاییەوە زۆر زوو تەریق دەکرێتەوە، یان هەر زوو دەمی دادەخرێت، لەبەر ئەوە ئێمە دەبێت دان بەوەدا بنێین کە رەگەزی مێینەی مرۆڤ لەهەموو بارەکاندا توشی دنیایەك لەمپەرو رێگری دەبێتەوە، ئەمە جگە لەوەی ئەگەر تەماشای ئەو تێڕوانینو وێنایە بکەین، کەکۆمەڵگا بۆ ژنی دەکات، لەئەو پەڕی توندوتیژیدا خۆی دەبینێتەوە، ئەوەتا ئەگەر پیاوێك لەگەڵ ژنێك دەمەبۆڵەی بێت، پیاوەکە بەوە تەریق دەکەنەوە، چۆن بەگژ ژندا دەچێت، ژن سەگ پێی ناوەڕێت، یان ئەو وێنای زەعیفەیەی بۆ ژن دەکرێت، هەروەها چەندین نمونەی تری لەو بابەتە، هەروەها لەناو خێزاندا ژنان سەرەڕای ئەوەی هەموو ئەرکی منداڵ بەخێوکردنو ماڵ بەڕێوەبردنیان لەسەرە، ئەبێت لەوپەڕی ملکەچیدا بن بۆ پیاوەکانیان، ئەمانەهەر هەمووی بەڵگەن بۆ ئەوەی چۆن تەماشای وێنای ژن دەکرێتو بەچ تێڕوانینێکی کەم تەماشای دەکرێت، ئێمە زۆر جار لەمنداڵەکانمان توڕە دەبین، بەتایبەتی لەکچە منداڵەکان، زۆر جار لەسەر شتی زۆر بێمانا لەکچەکان توڕە دەبین، ئەم توڕەبوونە کاریگەری لەسەر کەسایەتیان دادەنێت، هەرئەم کاریگەریە بۆ کایەکانی تری ژیانی ئەو دەگوازرێتەوە، بۆ نمونە ئەم کارە وادەکات ژن کەمتر دەستی بەلایەنە ئابووریەکە رابگات، هەر ئەمە وادەکات ژن مرۆڤێکی بێئابووری بێت، خاوەنی هیچی خۆی نەبێت، ئەوەی ئەو لەڕوی ئابووریەوە هەیەتی، تەنها ئەو ئابوریە بەکاربەرەی ناو ماڵە، ئەو ئابووریەی هیچ بەهایەکی کۆمەڵایەتیو ژیانی نییە، بەڵکو زۆر جار وەك کارێکی بێبەها تەماشای

دەكرێت، لەوانەی جێندەردا بەدرێژی دێینە سەر ئەم باسەو گفتوگۆی تەواوی لەبارەیەوە دەكەین، بەڵام مەسەلەیەكی گرنگ ماوە هێشتا قسەمان لەسەر نەكردوە، ئەویش پەیوەندی پەروەردەی خێزان‌و قوتابخانەیە، لەسەر پێكهاتەو كەسایەتی ئێمە چ كاریگەریەك دادەنێت، هەروەها چۆن دەبێتە ئەوەی كەئایندەی ئێمەی لەسەر بونیاد بنرێت، هەموو ئەمانە وامان لێدەكەن بەچاوێكی رەخنەگرانەوە تەماشای شێوازی پەروەردەی خێزانی‌و پەروەردەی خوێندن بكەین. لەبەر ئەوە پێویستە كەمێك بەوردی تەماشای ئەو پێكهاتانە بكەین بەشێكی كاریگەر لەكەسایەتی ئێمە دادەنێت‌و ئێمەش تاكو هەنووكە بەبێدەنگی قبوڵمان كردووە.

## شێوازی پەروەردەو بنەمای كەسێتی ئێمە پەروەردەی خێزانی

یەكێك لەو بوارانەی كاریگەری راستەوخۆ لەسەر پێكهاتەی كەسێتیمان دادەنێت‌و رەنگدانەوەی راستەوخۆی لەسەر ژیان‌و كەسێتیمان دەبێت، پەروەردەی ناو خێزانە، ئەم پەروەردەیە تەنها فێری ئسوڵی هەڵس‌و كەوت‌و مامەڵەكردنمان ناكات، بەڵكو لەسەر ئەو پەری توندوتیژی‌و جیاكاری رەگەزی فێرمان دەكات، دەتوانین ئەم كارە لەچەند خاڵێكدا كورت بكەینەوە:

1- ئەوەندەی لەناو ماڵدا گرنگی بەكوڕ دەدرێت هێندە گرنگی بەكچ نادرێت، ئەویش لەو باوەڕە باوەی كوڕ پشت‌و پەنایە، بەڵام نابێت ئەوەمان بیر بچێت، لەرۆژگاری ئەمڕۆماندا ئەوەی كوڕێك دەتوانێت



ئەنجامی بدات، بەهەمان شێوە كچەكەش دەتوانێت ئەنجامی بدات، هەروەها هەموو ئەو كارە ئەقڵیانەی كوڕێك پێی هەڵدەستێت، كچێكیش دەتوانێت پێی هەستێت، لەبەر ئەوە جیاوازی كردن لەنێوان كچ‌و كوڕدا هیچ بنەمایەكی زانستی نییە، بەڵكو بەشێكی خراپی ناو بیركردنەوەی كۆمەڵایەتی ئێمەیە، دەبێت كارێك بكەین ئەم تێڕوانییینە نەهێڵین.

2- كاتێك منداڵ دەكەوێتە تەمەنی یاریكردن، دێین یاریەكانیا جیادەكەینەوە، كوڕان لەدەرەوە گەمە دەكەن، كچان لەماڵەوە گەمە دەكەن، هەروەها یاری كوڕەكان بریتیە لەوەی چۆن جەنگاوەر بێت، یان چۆن ببێتە باوكێكی ستەمكار، هەروەها ئەو یاریانەی كوڕان دەیكەن پانتایی شوێنی یاریكردنەكە زۆر گەورەیە، بەڵام ئەم كارە بەپێچەوانەی گەمەكانی كچانەوەیە، ئەوەتا كچان بەهەندێك شت كەجارێكی تر دەیانكاتەوە بەدایكێكی نابەرهەمهێن، رادەهێنرێنەوە، هەروەها كچان لەشوێنێكدا گەمە دەكەن، پانتاییەكی زۆر بچوك پێكدەهێنێت.

3- منداڵی كوڕ لەشێوەی قسەكردندا فێری هەندێك زاراوە دەكرێن، زەحمەتە كچان بتوانن بەكاری بهێنن، یان هەربڕی لێبكەنەوە، وەك هەندێك جوێن كەفێری منداڵان دەكرێت، تەنها مافی كوڕەكانە ئەو قسانە بكەن، نەك كچان، هەروەها لەهەڵسوكەوتی رۆژانەدا فێری ئەوەدەكرێن چۆن كچان خزمەتی براكانیان بكەن ئەگەر لەتەمەنیشدا لەیەكتری جیاواز بن‌و كچەكە زۆریش لەكوڕەكە گەورەتر بێت.

4- دواتر كەدەگاتە تەمەنی خوێندن فرسەتی خوێندن بۆ كوڕەكە لەبارترە وەك لەكچەكە، ئەمەش وادوەكات زۆربەی دەرچوانی پلەبەرزەكانی خوێندن لەكوڕان بن، ئەمە جگەلەوەی ژمارەیەكی زۆر

لەکچان هەر ناخرێنە بەر خوێندن، ئەمانە هەر هەمووی هۆکارن بۆ ئەوەی ئێمە هەست بەو جیاوازییە گەورەیەی نێوان ئەم دوو مرۆڤە بکەین، یان لەبواری خوێندندا زۆر بەشی خوێندن هەیە کەمترین ژمارەی کچان تیایدا دەخوێنن، ئەم جگە لەوەی هەردوو رەگزەکە لەبواری خوێندندا لەیەکتری دادەبڕنو ناهێڵن پێکەوە بخوێنن، بەمەش گەورەترین کەلێن دەخەن نێوان ئەم دوو رەگەزەوە.

5- لەکاتی هاوسەرگرتندا کەم جار پرس بەکچەکە دەکرێت، ئەمە جگە لەوەی لەهەندێك ناوچە بازرگانیو کڕینو فرۆشتن بەکچانەوە دەکرێت، لەولاشەوە دیاردەی فرەژنیش بوەستێت، هەموو ئەمانەش لەکەسێتی ژن کەم دەکەنەوە بەرادەیەك ژن لەبوونەوەرێکی مرۆییەوە دەبێت بەکاڵایەك بۆ کڕینو فرۆشتن، هەروەها ئەوەی کەبەهەموو شێوەیەك قەدەغەیە کچان بەخواستی دڵی خۆیان هاوسەری ئایندەیان هەڵبژێرن، کەئەمانە لەپێگەی ژن کەم دەکەنەوە.

## چۆن چارەسەری ئەم گرفتانە بکەین

بۆ ئەوەی نەکەوینەناو ئەو هەموو گفتوگۆیەی سەبارەت بەو جیاوازییانە دەکرێن، بەڵام دەتوانین بەهەندێك خاڵ ئەو چارەسەرانە دیاری بکەین، کەبۆ ئەم بارە پێویستە:

1/ نەهێشتنی هەموو جیاوازییەك لەنێوان ڕەگەزەکاندا، جابەر هەر بیانوویەك بێت، واتە دابینکردنی فرسەتی یەکسان بۆ هەردوو رەگەز، تاکو هەریەکێکیان بتوانێت فرسەتی بەشداریکردنی کۆمەڵایەتی دەستبکەوێت، هەروەها ئەو فرسەتەشی دەستبکەوێت، کەلەسەر ئاستە



جیاجیاکانی زانستو هەموو بوارەکانی تری ژیان بتوانێت بوونی خۆی بسەلمێنێت.

2/ جیاوازی نەکردن لەجۆری خوێندندا، کەهەردوو رەگەز بتوانن دەستیان بەهەموو سەرچاوەکانی زانستو فێربوون بگات، بەڕادەیەك هەموو بوارەکانی خوێندنی لەبەردەمدا بکرێتەوەو بەهیچ بیانوویەك فرسەتی خوێندنی لێنەگیرێت، واتە بتوانێت خوێندنی باڵا بەئاسانی تەواو بکات، کەئێستا دەبینین کەمترین ژن خاوەنی بڕوانامەی باڵای خوێندنە، یان توانیوویەتی بگاتە ئاستێکی زانستی بەرز.

3/ کارکردن بۆ هێنانەدی یەکسانی رەگەزی، بەشێوەك هەموو مرۆڤەکانی کۆمەڵگا لەبەردەم یاسادا یەکسان بن، ئەم یەکسانیەش تەنها بەدەستەبەر کردنی یاسا نایەتەدی ئەگەر هوشیاریەکی کۆمەڵایەتی بەرفراوان لەپشت ئەم حاڵەتەوە نەبێت، هەروەها پێویستە هەمووان لەسەر ئەوە رابهێنرێن چۆن بەرگری لە پێکهاتەکانی خۆیان بکەن، بەرپرسیاریەتی ژیانی خۆیان لەئەستۆی خۆیان بگرن، دابینکردنی ئەم یەکسانییە ئەوەمان بۆ مسۆگەر دەکات کەس لەبری کەس بڕیار نادات، کەس بەناوی ئەوی ترەوە قسەناکات، ئەمانە بەرەو ئەوەمان دەبات چۆن بەشێوەیەکی دروست پەنا بۆ هێزی بیرکردنەوەی خۆمان بەرین، بەدەر لەهەموو ئەو بیرکردنەوانەی لەناو پێکهاتەی مێژوویی ئێمەدا هەیە، ئەو بیر کردنەوانەی ژن بەسەرچاوەی شەرەفو کەرامەتی خێڵ دەزانن، بۆ ئەم مەبەستە پێویستە دان بەمافی مرۆڤبوونی ژندا بنێینو هەروەها ئەوەشمان لەبەر چاو بێت تاژن ئازادی خۆی وەرنەگرێت ئەستەمە کۆمەڵگا بتوانێت ئازادییەکانی خۆی بەدەست بهێنێت

4/ نەهێشتنی هەموو ئەو نەریتانەی دەبنە هۆی ئەوەی ژن تووشی لێدانو سوکایەتیو کوشتنو ئەتك کردن ببنەوە، هەروەها هەوڵبدرێت دەوڵەت یاسای سزایی تایبەت بەو مەسەلەیە دەربکات، ئەمە جگە لەوەی هەوڵ بۆ ئەوە بدرێت مەسەلەی ژنان وەك مەسەلەیەکی تەواو مرۆیی تەماشا بکرێت، هەروەها نەفرەت کردن لەو نەریتانەی دەبن بەهۆی ئەوەی ژنانو کچان بازرگانیان پێبکرێت، یان ببن بەقوربانی تاوانی پیاوانی خێڵو خوێنیان پێخۆشبکرێت یان بۆ کەسێکی تر بدرێنە شوو، هەروەها مەسەلەی ئەوەی ژن خاوەنی ئەهلیەتی یاسایی نییە، لەبوارەکانی بەخێوکردنی منالّو وەرگرتنی مافی جیابوونەوەو میراتی، هەرهەمخوو ئەمانە بکرێنە جێگەی کارکردن بەوەی بتوانین لەماوەیەکی کەمدا هەموو ئەو یاساو نەریتانە بکەین بەبەشێك لەمێژوو وەك کارێکی خراپی نەوەکانی پێشوو بەنەوەکانی داهاتوومانی بلێینەوە

5/دایکانو باوکان فێر بکەین لەشێوەی پەروەردەکردندا بەهیچ شێوەیەك جیاوازی لەنێوان کوڕانو کچاندا نەکەن، ئەویش لەیەکەم ڕۆژی لەدایك بوونەوە تاکو گەورەش دەبن، هەروەها ئەوەش لەبەر چاو بگرن ئەم جۆرە لەپەروەردە سەرەتایەکە بۆ دەستکەوتنی نەوەیەکی ئازاد، توانیبێتی خۆی لەو هەموو ناخۆشیانەی نەوەی پێشوو رزگار کردبێت، لێرەدا مەبەسمان لەوە پەروەردەیەیە، کەهەریەك لەدایكو باوك پێیهەڵدەستێت، کەپەروەردەی منالّ بەپێی تازەترین تیۆرەی دەروناسی منالّ لەیەکەم ڕۆژی تەمەنەوە دەست پێدەکات، تادوا ڕۆژی ژیان درێژ ئەبێتەوە، ئەو هەڵسوکەوتە پڕ میهرەی بەرامبەر بەکچێك



وەك کەسێکی لاواز لەمنالّیدا ئەنجامی دەدەین، هۆکاری یەکەمە بۆ ئەوەی کەسایەتی ئەم کچە لاواز دەرچێت

6/ جیانەکردنەوەی کارکردن لەسەر بنەمای رەگەز، وەك ئەوەی ئەمە کاری پیاوانەو ئەمیان کاری ژنانە، کەتاکو ئێستا هەندێك کار هەیە بەکاری پیاوان ناسراوەو ژن نەیتوانیووە کاری تێدا بکات، یان هەندێك کار هەیە لەناو ماڵدا بەکاری ژن ناسراوە، بەڵام لەدەرەوە وەك کاری پیاوان تەماشای دەکرێت، ئەم دووفاقیە لەملمەلّ کردندا بۆ خۆی مانای ئەوی هەیە، کەهەر کارێك بنەمایەکی ئابووری هەبوو وەك کاری پیاوان تەماشای دەکەین، بەڵام ئەگەر کارێك زۆر گرنگیش بێت بەڵام بنەمایەکی ئابووری نەبێت وەك کاری ژنان تەماشای دەکەین، ئەمیش دەبێتە هۆی ئەوەی رەگەزێك بەسەر ئەوی تردا زاڵ بێتو دەرئەنجام توندوتیژی دژی رەگەزی مێینەی لێبکەوێتەوە.

دەرئەنجام ئەگەینە ئەو باوەڕەی توندوتیژی بەهەموو بنەماکانی مومارەسەکردنییەوە، ئاراستەیەك نییە بۆ گەشەسەندنی کۆمەڵایەتی یان ئەوەی بنەمایەك بێت بۆ پەروەردەکردنی نەوەکانمان، بەڵکو توندوتیژی بۆخۆی کاردانەوەی مرۆڤێکە، کەلەباری نەخۆشی دەروونیدا، وەك کاردانەوەیەکی لاوازی بەم کارە هەڵدەستێت، هەروەها کاتێك مرۆڤ هاوسەنگی مرۆییو دەروونی خۆی لەدەست دەدات، پەنا بۆ بەکارهێنانی توندوتیژی دەبات، بۆ ئەوەی ئێمە بتوانین لەم بارە ئاڵۆزو نامرۆیە خۆمان رزگار بکەین، هەروەها لەسەر بنەمای لەیەکتر گەیشتن ئەم کارە ئەنجام بدەین، دەبێت بەهیچ کلۆجێك پەنا بۆ بەکارهێنانی توندوتیژی نەبەین، لەگەڵ هیچ کەس بەکاری نەهێنین، چ جای ئەو

کەسانە نزیکترین کەسانی ئێمە بن، بەو شێوەیە دەتوانین بڵێین دەستمان بە کۆمەڵگایەکی ئاسوودە دەگات، کۆمەڵگایەك جگە لەخۆشەویستی هیچی تری بۆ بەرخوردکردن تێدا نەبێت.

## هاوڕێیەتی شەقڵێکی تر بۆ نواندی توندوتیژی

ئەو دەمەی بیر لەوە دەکەیتەوە لەدەرەوەی بوونیادی نائاسایی خۆت مرۆڤێك بناسیت، سەرەتا لەبەردەم پرسیارە ئاڵۆزەکانی پێشتر لێتکراوە، بەرەو رووەدەبیتەوە، ئەو پرسیارانەی سەبارەت بەوەی هاوڕێیەتی کێدەکەیتو ئەوە کێ بوو قسەت لەگەڵدا دەکردو ئەوە ئێوە لەکوێ یەکترتانناسی، کەی ئەم کەسەو ناسیو لەخوڕەوشتو هەڵسو کەوتی دڵنیایتو دەیەها پرسیاری تری لەو جۆرە، ئەوانەشی پرسیارەکانت لێدەکەن، لەباوکەوە دەستپێدەکات، تا بەمامۆستاو کاگوزارو پۆلیسی بنکەی گەڕەکەکەتانو مەلای مزگەوتی گەڕەكو هاوڕێکانی دەورووبەری خۆت دەگات، ئەم پرسیارانە هێندە دووبارە دەبنەوە، ناچار دواجار دەبێتە بەشێکی تەواو کارا لەنەستمانو ئێمەش بەو پەڕی گوێڕایەڵیەوە، بەبێ ئەوەی پرسیار بکەین، ئێوە مەبەستان لەم پرسیارانەچیە، دووبارەی دەکەینەوە، بەبێ ئەوەی بەخۆمان بزانین ئێمەش بووین بەبەشێك لەو پرۆسە جاسوسییەی هەموومان تێیدا بەشدارین، دەتوانین هەرهەموومان لەیەك سیفەتدا کۆببینەوە، ئەویش نواندنی کاری سیخوریە، واتە بەشێوەیەك لەشێوەکان هەموومان سیخورین، بەڵام هەرهەموومان بەناوی پاراستنی ئاکارو ئەخلاقی کۆمەڵگاوە ئەم کارە دەکەین.



خاڵێکی تری نادرووستی پەیوەندی لای ئێمە بەپرۆسەیەکی تەواو نەخشە بۆکێشراودا تێپەڕدەبێت، ئەگەر هەرکەس لەو نەخشەو پلانە لابدات، بەقۆڵبڕو ساختەچی ناوی دەرکردووە، ئەمە جگە لەوەی چیدی کەس متمانەی پێناکات، دەبێتە کەسێکی بێزراو، لەبەرئەوە مەسەلەی تەواونەکردنی خولی ئاسایی پەیوەندی بۆخۆی گەورەترین کارەساتی بەدواوەیە، بەتایبەتی تەواونەکردنی ئەم خولە لەلایەن کچانەوە دەبێتە گەورەترین کارەسات، تەنانەت ئابڕوچوونی گەورەی بەدواوەیە، لای هەمووان ئاشکرایە، لەپەیوەندی ناو کۆمەڵگای ئێمەدا یەکەم مەرج بۆ دروستبوونی پەیوەندی نێوان هەردوو ڕەگەز بریتیە لەوەی پێویستە ئەم پەیوەندییە بەزەماوەندو ژیانی هەمیشەیی تەواو ببێت، لێرەوە ئەو کارەساتە دەستپێدەکات کەناوی پەیوەندییەو بەناوی خۆشەویستیشەوە ئەم کارە دەکرێت، بۆ نمونە ئێمە زۆرجار بیستوومانە کەدوو مرۆڤ بەپەیوەندی خۆشەویستی زەماوەندیان کردووە، بەڵام زوو لەیەکتری جیابوونەتەوە، لەزۆربارردا ئەم جۆری جیابوونەوەیە بۆ بوونی ئەو پەیوەندیە دەگێڕێنەوە، کەئەم دووانە پێشتر لەگەڵ پەیوەندیان هەبووە، بەڵام لەئێستادا متمانەیان بەیەکتری نەماوە، لێرەوە جۆرێك لەتێگەیشتنی باو بۆ پەیوەندی دروست دەبێت، ئەویش ئەوەیە نەبوونی پەیوەندی خۆشەویستی یەکێکە لەهۆکارەکانی سەرکەوتنی زەماوەند، ئەمانە ئەو تێگەیشتنانەن، لەرۆژگاری ئەمڕۆماندا زۆرێك لەناوەندە کۆمەڵایەتییو یاساییو هەندێك لەهێزە سیاسیەکانیش بەکاری دەهێنن، لەبەر ئەوە مەسەلەی بوونی پەیوەندی لەناو ئەم جۆرە پێکهاتەیەدا وەك جۆرێك لەلادان لەو نەریتانە تەماشای دەکرێت، کەئەمان خۆیان

بەپارێزەری دەزانن، لەبەر ئەم خاڵەیە، کاتێك بچوکترین خەوش لەم پەیوەندیانەدا دەرکەوێت، دەیکەنە هەراو زەنایەك ئەوپەڕی دیار نەبێتەوە، ئەم کارەش لەبەرئەوە دەکەن، تاهەموو ئەو کارەساتانەی خۆیان خولڤاندوویانە پەردەپۆشی بکەن‌و نەهێڵن کەس قسە لەسەر لایەنە نەگەتیفو خراپەکانی ئەم تێڕوانینانەی ئەمان بکات، کەلەژیاندا پەیڕەوی لێدەکەن‌و وەك بەهایەکی جێگیر تەماشای دەکەن، ئەمانە ئەو سەرەتایەن کەبنەماکانی پەیوەندی نێوان ڕەگەزەکانی ناو کۆمەڵگای ئێمەی لەسەر دامەزراوە، ئەو بنەمایانەن ئێمە پەیڕەوی لێدەکەین‌و بەکارێکی جوان‌و شایستە، بەڕێزگرتن ناوی دەبەین، لێرەوە تێدەگەین ئێمە لەکوێی تێگەیشتن لەپەیوەندیدا وەستاوین، ئەم مەسەلەیە دەتوانین لەناو چوارچێوەیەکی تەواو کۆمەڵایەتیدا خوێندنەوەی تری بۆبکەین، خوێندنەوەیەك بەدەر لەهەموو ئەوانەی دەمانەوێت هەڵوێستەی لەسەر بکەین، ئەم کارە دەمانباتەوە بۆ لای ئەوەی ئەم مەسەلەیە لەناو چوارچێوەیەکی تیۆریدا ئاماژەکانی دیاریبکەین، بەڵام ئێمە ئێستا لەم سەرەتایەدا تەنها قسە لەسەر ئەو تێڕوانینە کۆمەڵایەتییە دەکەین، کەپێی دەوترێت پەیوەندیە خۆشەویستیەکان، جگە لەکارێکی شەیتانی هیچیتر نییە، هەموو ئەمانە ناچارمان دەکەن بەدەر لەهەر تێڕوانینێك، کەهەمانە بەشێوەیەکی تر مەسەلەی پەیوەندی تەماشابکەین، باجارێك لەسەر ئەو نمونە کۆمەڵایەتی‌و میللیانە بدوێین، کەبۆ پەیوەندی خۆشەویستی و هاوڕێیەتی هەیانە، ئێمە لەم چەند دێڕەی سەروەدا تەنها باسمان لەمەسەلەی پەیوەندیەکی دیاریکراو کرد، بەڵام لێرەدا بەشێوەیەکی ترو لەسەر ئاستێکی تر باس



لەمەسەلەی هاوڕێیەتی دەکەین، کەمەسەلەیەکە زۆر لەمەسەلەی خۆشەویستی‌و بوونی پەیوەندی تاکەکەسی جیاوازترە، دەتوانین راشکاوانە ئەوە بڵێین، لای ئێمە جگە لەپەیوەندیە خوێنیەکان، پەیوەندی نێوان مرۆڤەکانی تر پەیوەندیەکی قورسەو کەمتر قبوڵ دەکرێت، لەبەر ئەوەی مەسەلەی هاوڕێیەتی لەناو کۆمەڵگای ئێمەدا هەمیشە هەڵگری دنیایەك مەترسی بووە، هەڵگری ئەو ڤایرۆسانە بووە، کەئەخلاقی کۆمەڵایەتیمان دەشێوێنێت‌و تووشی دارِزینی دەکات، کێ هەیە لەئێمە لەلایەن گەورەکانەوە ئامۆژگاری ئەوە نەکرابێت، کەنەچێتە کۆڵان‌و هاوڕێتی کەس نەکات، چونکە هاوڕێی خراپ تووشی بەڵایەکمان دەکات، گرفتەکە لەوێدایە ئەوانەی ئەم قسەیە دەکەن، خۆیان لەدەرەوەی ماڵ خاوەنی کۆمەڵێك ناسیاون، کەمترین متمانەیان بەیەکتری هەیە، ئەم نادرووستیەی پەیوەندی گەورەکان، لەسەر ئەخلاقیەتی بچوکەکانیش رەنگ دەداتەوە، هەریەکەمان بەشێوە ئاگایی‌و وریاییەوە مامەڵە لەگەڵ ئەو هاوتەمەنانەمان دەکەین، کەدەمانەوێت ببین بەهاوڕێیان، لێرەوە یەکەم سەرەتای بێمتمانەیی نێوان هاوڕێکان دەست پێدەکات‌و بۆ ناو هەموو یەکەکانی ژیان درێژ دەبێتەوە، لەم بیرکردنەوەیەوە دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی هەموو ئاستە جوانەکان بەرەو پرۆسەیەکی بەسیاسەتکردن دەبەین، هەوڵدەدەین زۆرترین ستراتیژیەت بۆ ئەم کارەمان بدۆزینەوە، بەبێ ئەوەی هەست بکەین ئێمە لەناو گەمەیەکدا کارەکانمان ئەنجام دەدەین، ئێمە ناومان ناوە خۆشەویستی، کەخۆی لەبنەمادا هەوڵە بۆ داگیرکردنی ئەوی ترو کۆنترۆڵکردنی ئەوی تر، ئەمە بەشێکە لەو پرۆسەیەی ئێمە دەمانەوێت

بەناوی هاوڕێیەتیەوە گوزارشتی لێوە بکەین، کام منداڵ لەناو کۆمەڵگای ئێمە رایەکی تەواو سلبی لەسەر هاوڕێ لادروست نەبووە؟، کێ هەیە لەئێمە بۆ ئەو سەرەتایە نەگەڕێتەوە، کەمنداڵی بۆ متمانە بەوی تر پێیبەخشیووین؟، ئەمانە ئەو ململانێیەیە کەکۆمەڵگا بۆ دۆزینەوەی پەیوەندی هەوڵی بۆ دەدات، یەکێك لەو کارەساتانەی لەم جۆرە بیرکردنەوەیەوە دەردەچێت، کوشتنی ئەوی ترە، ئەوی تر بەهەموو ماناکانییەوە، واتە ئێمە هەمیشە یان لەوی تر دەترسین، یان لەناوی دەبین، یان لەخۆمانی دووردەخەینەوە، ئەمانە هەموو دەبنە بنەمایەکی تەواو کاریگەر بۆ هزرو ئەقڵیەتی ئێمە، دەبێتە ئەو باگراوندەی دەمانەوێت کارەکانی خۆمانی لەسەر ئەنجام بدەین‌و بوونیادی تێزێکی فەلسەفیانە بۆ ئەم قبوڵنەکردنی ئەوی ترە بدۆزینەوە، ئەمە ئەو سەرەتاییەیە، کەبنەماکانی تۆتالیتاریەت‌و دیکتاتۆریەت‌و هێزی پەڕگیری ئایینی یان هەرهێزێکی تری تاکڕەوی لێدەکەوێتەوە، ئەمانە دەبنە دەسپێکی ئەو کارکردنەی هەر هەموومان رقمان لێیەتی‌و ناچارین قبوڵیشی کەین، ئێمە زۆر کات باس لەدیموکراتی‌و مەدەنیەت، دەکەین، بەڵام کاتێك مەسەلە دێتە سەر مەسەلەی پەیوەندی مناڵەکانمان لەگەڵ ئەوانی تر دنیایەك تەفسیرو شیکردنەوەی لۆژیکی بۆ کارەکەمان دەدۆزینەوە، لەم کاتەدا هەرگیز هەست ناکەین بچوکترین هەڵەمان کردووە، لەبەر ئەوەی کەلتور، پەروەردە، ئاین، کۆمەڵگا، ترادیسیۆنەکان، بیرکردنەوەی ئێمە لەژیان، فێری جۆرێکی ترسناك لەدووفاقی کردووین، ئەو دووفاقیەتەی هەموو پێکهاتە دەروونی‌و ژیانیەکانی گرتووەتەوە، لەبەر ئەوە ئاسایە کاتێك لەناو کایەیەکی لەو جۆرەدا باس



لەخۆشەویستی‌و پەیوەندی دەکرێت هەموو بەهاکان ببن وەهم، ببن بەوەی ئابڕومان بچێت

## کاتێک توندوتیژی لەمومارەسەکردندا دەگاتە فەنتازیاکردن، لەکوێدا دەستمان بەجوانیدا بگات

ئاشکرایە سەدەی بیست، کەتێپەڕی بەسەدی توندوتیژی‌و زەبروزەنگ ناسرا، لەبەر ئەوەی هەڵگری ئەو کارەساتانە بوو، کەهەموو مرۆڤایەتی لەبەر دەمیدا هەستیان بەشەرمەزاری تەواو کرد، سەدەی داهێنانە گەورەکانی تەکنەلۆژیای جەنگ بوو، هەموو ئەمانە وای کرد توندوتیژی نەریتیی پێناسەی زۆر نوێ وەربگرێت‌و ببێتە پێکهاتەیەك نەناسرابێت، بۆ ئەوەی ئەمەمان باشتر لاڕوون‌و ئاشکرا بێت، دەتوانین چاوێك بەزانستی تاوانی نوێدا بخشێنین، ئەو کات تێدەگەین، مرۆڤایەتی لەتاوان‌و کوشتن‌و بەکارهێنانی توندوتیژیدا چ ئەفراندنێکی کردووە، چ پەرەسەندنێکی گەورەی لەم بوارەدا بەدەست هێناوە، هەموو ئەمانە وامان لێدەکەن بەچاوی گومانەوەو تەماشای هەموو ئەو داهێنانە بکەین، کەمرۆڤایەتی بۆ خۆشنوودی ئەوانیتر بەرهەمی هێناوە، هەروەها ئەوەشمان بیرنەچێت ئەم داهێنانە نوێیە وایکردووە کۆمەڵێکی زۆر سەرقاڵی توێژینەوەو کاری مەیدانی بن بۆ ناساندنی ئەم چەمکە، کەیەکێکە لەو چەمکانەی زۆرێك لەتیۆرستە کۆمەڵایەتی‌و دەروونناسەکانی بەخۆیەوە سەرقاڵکردوە، ئێمە دەزانین ئەم چەمکە چەندێك دەرئەنجامی ترسناکی لێدەکەوێتەوە، هەموو ئەو کاراسەتانەی مرۆڤ لەبەر بەرژەوەندیەکی بچوك ئەنجامیان داوە، بوونەتە هۆی ئەوەی

زۆرترین ژمارەی قوربانی هەبن، بۆ ئەوەی باشتر لەسەر ئەم دیاردەیە قسەبکەین، ناچارین سەرەتا بپرسین توندوتیژی چییە؟، ئالێرەدا لەگەڵ ئاستەنگیەکی گەورەدا بەرەو ڕوو دەبینەوە، لەبەر ئەوەی هەر کۆمەڵگایەك بەپێی تێڕوانینی خۆی تەماشای توندوتیژی دەکات، بەڵام دەتوانین بڵێین، هەر کردارێك ببێتە هۆی ئازاری جەستەیی یان دەروونی بەتوندوتیژی ئەژمار دەکرێت، بەڵام ئایا توندوتیژی سیفەتێکی سروشتی هەیە یان حاڵەتێکە مرۆڤ بەپێی مومارەسەکردنی ژیان دەستی دەکەوێت؟ بۆ زانینی وەڵامی پرسیارێکی لەو جۆرە، دەبێت پەنا بۆ مێژوی مرۆڤایەتی بەرین، کەچۆن توندوتیژی بۆ مەبەستی تایبەتی خۆی داهێناوە، هەندێك لەبیریارەکانی بواری توندوتیژی رایان وایە توندوتیژی بەشێکی دانەبڕاوی سروشتی مرۆڤایەتییە، ئەم مەیلە توندە وای لێدەکات لەگەڵ کەسانی تردا بەشەڕ بێت، ئەگەر تەماشای دەوروبەری خۆمان بکەین، چەندەها جۆرو شێوەی توندوتیژیمان بەر چاو دەکەوێت، هەرهەموویان بەشێکن لەو بیرکردنەوە کەلتوریەی ئێمە، کەبەشێك لەبیرکردنەوەی ئاینی ئێمە بۆ توندوتیژی بۆ ئەوە دەگێڕنەوە، کەمرۆڤ لەبەرئەنجامی گوناهی خۆیەوە توشی ئەو سزایە هاتووە، واتە مرۆڤ وەك خەتایەك یان تاوانێك یان بەرئەنجامی تاوانێك درووست بووە، کاتێك مرۆڤ دەکەوێتە بەردەم ئاستەنگیەکی لەم جۆرە، دەکەوێتە بەردەم بیرکردنەوەیەکی موتڵەقی لەم شێوەیە، ئەگەر لێکدانەوەی ووردی نەبێت ئەوە دەکەوێتە بەر ئەو گومانەی ئەم گریمانەیە بەموتڵەقی راستەو لەژیانی رۆژانەی خۆیدا بەکاری دەهێنێت، یەکێك لەو چەمکانەی لەناو ئایدۆلۆژیای ئاینیی هاوچەرخدا



بەکاردەهرێنرێت توندوتیژیە، لەبەر ئەوەی وەك سیفەتێکی رەهاو خواوەندانە وەرگیراوە، سەرهەڵدانی هێزی پەرگیری ئاینی لێرەوە سەرچاوەی گرتووە، لێرەدا نچارین پەنا بۆ هەندێك پێناسەی تیۆریستانی بواری سۆسیۆلۆژیاو سایکۆلۆژیا بەرین، بەتایبەتی ئەوانەی سەبارەت بەتوندوتیژی رای تایبەتیان هەیە، یەکێك لەو تیۆرستانە هەنا ئەراندێتە، لەکتێبی سەبارەت بەتوندوتیژی، ئاوا پێناسەی توندوتیژی دەکات: توندوتیژی کارێکە، لەدەرئەنجامی تووڕەییەوە دەبێت، ئەو مەسەلەیەی، کەهەمووان لەسەری کۆکن، توندوتیژییە، لەوانەیە ببێتە حاڵەتێکی نائەقلانیو نەخۆشی، بەڵام ئایا ئەمە حاڵی هەموو سۆزە مرۆییەکان نییە؟( ارندیت،1992: ل56)، لێرەدا لەگەڵ بیرکردنەوەیەکی ئەقلانی، کەهەڵگری ئاستەنگی خۆیەتی بەرەو روو دەبینەوە، ئەویش ئەوەیە ئەگەر توندوتیژی دەرئەنجامی هەڵچونی دەوونی بێت، ئایا هەموو سۆزو هەستەکانی مرۆڤ دەرئەنجامی هەمان کار نییە، ئایا ئێمە لەکاتی مومارەسکردنی خۆشەویستیدا ناگەینە ئەو پەڕی خرۆشانی دەروونی؟، لەناو گەمەکاندا ناگەینە هەمان حاڵەت، ئەدی لەبۆنە خۆشو یادەواریەکانماندا؟، هەموو ئەمانە وامان لێدەکەن لەسەر ئەم رستەیەی ئارندێت هەڵوێستەیەك بکەین، دەکرێت لێرەدا باس لەوە بکەین، جگە لەتوندوتیژی هەموو هەڵچونەکانیتر بەشێکی گرنگن لەهەستە هوروژاوەکانی ناخی مرۆڤ، بەڵام ئایا مرۆڤ لەدوا پلەی خرۆشانیدا ناگاتە توندوتیژی؟، زۆرجار دەبینین، کەخۆشەویستی دەگاتە پلەی تەمەلوککردن، باڵاترین جۆری توندوتیژی تێدا دەردەکەوێت، لەهەمان کاتدا ئێمە ناتوانین ئەم پەیوەندیە ناو نەنێین خۆشەویستی،

لەبەر ئەوەی ئەوە ئەو دوومرۆڤە دەتوانن ماناکانی خۆیان بۆ توندوتیژی دیاریبکەن، کەئەمە تێگەیشتنێکە وامانلێدەکات لەزۆرێك لەئاستەنگییە فکریەکان دوور بکەوینەوە، لەزۆرێك لەو هەڵانە دوور بکەوینەوە، کەئەمێستا هەندێك تێگەیشتن بەیانی دەکەن، لەبەر ئەوە دەتوانین بۆ ئەو پێناسەیەی ئاراندێت ئەم پێناسەیەی دکتۆرە لەیلا عەبدولوەهاب وەربگرین، کەپێی وایە:ئاکارو کردارێکە, هەڵگری سیفەتێکی دوژمنکارانەیە, لەلایەنێکەوە دەردەچێت, لەوانەیە تاکە کەس یان کۆمەڵێك کەس, یان دەوڵەت بێت, مەبەست لێی ملکەچ پێکردنو بەکارهێنانی لایەنی بەرامبەرە, ئەویش لەپەیوەندیەکی نابەرابەر, لەڕووی ئابوری یان کۆمەڵایەتی یان سیاسیەوە, کە دەبێتە هۆی زیانی مادی یان مەعنەوی یان دەروونی تاك یان کۆمەڵ یان دەوڵەتێکی تر(عبدالوهاب,2000: 16). ئەم پێناسەیە زۆر گشتگیرە، بەڵام گرنگی لەم شوێنەی باسەکەماندا ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە، مەبەست لەتوندوتیژی چییە، راستە ئەم پێناسەیەناتوانێت ناونیشانی باسەکەمان لەخۆ بگرێت، لەبەر ئەوەی ئێمە باس لەتوندوتیژی ناکەین، وەك حاڵەتە سروشتیەکەی، بەڵکو وەك بەکارهێنانی ئەو فەنتازیایەی لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا بۆ مومارەسەکردنی توندوتیژی بەکار دەهێنرێت، ئەم پێناسانە بەشێوەیەك لەشێوەکان دەماناتەوە لای بیرکردنەوەی ئەفسانەیی دێرین، ئەویش دروستکردنی سروتێکی ئایینیە بۆ مومارەسکردنی کەشێکی پڕ توندوتیژی، بۆ گەڕانەوە بۆ ئەو سروتە ئاینیە وامان لێدەکات، قوربانی بەبەشێك لەپرۆسەی بەردەوامی ژیان تەماشای بکەین، نەك وەك ئەوەی بەشێك بێت لەو پرۆسەیەی کەسێك



دەبێتە ئەو کەسەی توندوتیژی بەرامبەر کراوە، بۆ ئەوەی باشتر لەم حاڵەتە بگەین، باپێناسەیەکی نووسەری عەرەبی تورکی عەلی رەبیعۆ وەربگرین، دەڵێت: لەزۆربەی میتۆلۆژیاکاندا سەربڕینی بووەنەوەرێکی میتۆلۆژی، لەلایەن بوونەوەرەێکی میتۆلۆژی ترەوە، وەك دەسکەوتێك چاو لێدەکرێت، پێویستە لەسروتێکی تایبەتیدا بپارێزرێت، پێویستە جارێکی تر لەخوێندنەوەی دەقە میتۆلۆژیەکەدا دیاربخرێتەوە، لەلایەکی ترەوە دامەزراندنی رژێمێکی نوێیە لەسەر بنەمایەکی میتۆلۆژی، لێرەوە هەموو بنەماو یاساو قەدەغەو دیاردە رۆشنبیریەتازەکان سەرهەڵدەدەنو دواتر مرۆڤەکانی تر پەیڕەوی لێدەکەن( ربیعو،1997: دەستنوس) ئەم پێناسە کورتەی توندوتیژی میتۆلۆژی بۆخۆی دەمانخاتە بەر ئەو گریمانەیەی کەتوندوتیژی ناو کۆمەڵگای ئەمڕۆمان، ئاراستەیەکە بۆ دروستکردنی سستمێکی متۆلۆژی نوێو دروستکردنی خواوەندێك، وەك ئەوەی ئەریك فرۆم لەکتێبی ئایینو شیکردنەوەی دەروونیدا باسی لێوەدەکات، کەئەم دۆزینەوە نوێیە مەبەست لێی دۆزینەوەی مەزهەبێکی هاوبەشە بۆ ئاراستەکردنو بابەتێك بۆ پەرستن( فرۆم،1999: 29)، لێرەوە تێدەگەین نواندنی ئەو فەنتازیایەی ئەمڕۆ لەناو توندوتیژیدا بەرچاو دەکەوێت، بۆ دۆزینەوەی ئەو ئاراستەیە دەگەڕێتەوە، کەبەشێك لەمرۆڤایەتی دەیەوێت پەیوەندیەکانی خۆی لەسەر بوونیاد بنێت، هەموو ئەو ئاماژانەی لەم تێڕوانینەی فرۆمدا کاردەکەن، بریتین لەدۆزینەوەی بابەتێك بۆ پەرستن، لەهەمان کاتدا ئەم کارە وامان لێدەکات ئایا مرۆڤ بەبێ بوونی ئەم ئاراستەیە دەتوانێت درێژە بەژیانی خۆی بدات، ئەگەرچی فرۆم رای وایە لەناو مرۆڤایەتیدا شاراستانیەتێك

پەیدا نابێت، ئاینێکی تێدا نەبێت، ئاینیش بەپێی ئەو پێوانەیەی سەرەوە، بەڵام ئایا دەکرێت مرۆڤایەتی دەستبەرداری توندوتیژی ببێت؟، ئەمە ئەو پرسیارەیە جەوهەری بیرکردنەوەی مرۆڤایەتی داگیرکردووە، هەموودەم لەهەوڵی ئەوەدایە بگاتە وەڵامێك ژیانی بەرەو ئاسوودەییو هێمنی ببات، لێرەدا بۆ ئەوەی باشتر لەم مەسەلەیە بگەین ناچارین بۆ بیرکردنەوەی ئەفسانەیی بگەڕێینەوە، کەلەسرووتی ئەفسانەیدا هەمووان کۆکن لەسەر مومارەسەکردنی توندوتیژی، لەدژی قوربانی، لەبەر ئەوەی کۆکبوون لەسەر توندوتیژی هۆکارێکە بۆ گەڕانەوەی ئاشتیو یاسا بۆ جیهان، دەتوانین ئەمەش بەتوندوتیژی سیاسی ئۆتۆکراتی ناودێری بکەین، ئەمە لەناو بوونیادی ئەفسانەدا، کوقوربانی بوونەوەرێکی ئاساییە، بەڵام لەو کاتەوەی مرۆڤ لەخوێنی ئەو بوونەوەرە ئەفسانەییە دروست دەکرێت، ئەمجارە پێویستە قوربانییەکە لەمرۆڤدا بێت، لەبەر ئەوەی نەوەی زیندووی خواوەندێکی تاوانبارە( ربیعو،1997:دەستنوس)، لێرەدا لەوە دەگەین توندوتیژی هێندەی رەهەندێکی سیاسیانەی هەیە، هێندە رەهەندێکی کۆمەڵایەتی نییە، بەڵام کاتێك بۆ ناو کایە کۆمەڵایەتییەکانم دەگوازرێتەوە، مانای وایە پەیوەندیە کۆمەڵایەتییەکان بەتەواوەتی بەسیاسەت بارگکاوی بووە، لێرەدا تێزی بەرژەوەندی بەزەقی بەدیار دەکەوێت، کەبەرژەوەندییەکان بنەمای پێکەوە ژیانی هەموومان دیاریدەکات، نەك ئەوەی ئێمە دوو مرۆڤین دەمانەوێت ببین بەخاوەنی جیهانێك، لەوەی ئەوانی تر نەچێت، یان لانی کەم پەیوەندی بەو دوو کەسەوە بێت کەدەچنە ناو پرۆسەیەکی پەیوەندییەوە، وەدەتوانین ئەو توندوتیژیەی باسمان لێوەکرد، لەم



رستەیەی میلزدا کورتی بکەینەوە: هەموو سیاسەتێك، جۆرێکە لە کێشمەکێش لەپێناو دەسەڵاتدا، توندوتیژیش دوا پلەی دەسەڵاتە(أرندت، 1992: 31)، ئەم دواپلەی دەسەڵاتە بۆ ناو هەموو کایە کۆمەڵایەتییەکانی ئێمە گوازراوەتەوە، بەئاستێك دەتوانین لەپەیوەندی نێوان هەردووانێکدا بەئاسانی چاومان پێی بکەوێتو هەستی پێبکەین، ئەم تێڕوانینە بەرەو ئەو ئاقارە دەمانباتەوە، کەهەست بکەین ناهەوسەنگیەك لەجۆری پەیوەندی ئێمەدا هەیە، پێویستی بەدەستنیشانکردنە، ئەو ناهاوسەنگیە بۆ هەندێك بنەمای تایبەتی ناو ناخی خودەکان ناگەرێتەوە، ئەوەندەی بۆ دۆخی بەئایدۆلۆژیبوونی ئەو پێکهاتەیە دەگەڕێتەوە، ئەو پێکهاتەیەی، جگە لەدۆزینەوەی بنەماکانی ستەمکاریو سەرکوتگەری بەرامبەر لەهیچ دۆخێکی تردا نەیویستووە بونێك بۆخۆی دیار بکات، لەبەر ئەوە کەدێینە سەر ئەوەی باس لەجۆری توندوتیژی ناو خۆمان بکەین، بۆ ئەو بنەما میتۆلۆژییە دەگەرێینەوە، کەهەریەکەمانی پێداتێپەڕدەبین، هەندیك لە بیریاران بەو ئاکارەی دەناسێنن, کەوەڵامدەرەوەی وروژێنەرێکی دەرەکیە, کەئازار بەبەرامبەرەکەی دەگەیەنێتو پڕیەتی لە هەڵچونی دەروونیو توڕەییو بەرەنگاربوونەوە, کەهۆکارەسەرەکیەکەی بۆ نوشستی(الاحباگ) دەروونی دەگەرێتەوە, کەلەئەنجامی کۆنترۆڵەوە ئەم حاڵەتە پەیدا دەبێت، لێرەدا مەبەستمان لەکۆنترۆڵ چییە، ئایا ئەو سانسۆرە خودییە، کەهەریەکەمان بەسەر خۆمانەوە داماننناوە، یان ئەو هەموو یاساو عورفو عاداتەیە، کەکۆمەڵگا بەسەریدا سەپاندووین؟، دەکرێت بڵێین هەردوو حاڵەتەکەیە، لەهەمان کاتدا، ئەو بنەمایەی زیاتر دەکرێت بەهەند وەریبگرین، بنەما

خودییەکانی ناخی خۆمانە، کەناتوانێت لەو هەموو بنەما ئاکارییە تەقلیدییە خۆی رزگار بکات، ناتوانێت ئەو هەموو خواسەتە خەسێنراوەی ناخی بتەقێنێتەوەو بەرەو ژیانێك هەنگاو بنێت، کەخۆی بیری لێدەکاتەوەو ئازاری ئەوانی تری تێدا نییە.

لێرەدا دەچینە بوارێکی تری توندوتیژییەوە، ئەویش ئەو توندوتیژیە رەمزییە لەنێوان دەسەڵاتە جیاوازەکاندا مومارەسەدەکرێت، بۆ تێگەیشتن لەم بابەتە کارێکی ئاسان نییە هەروا بەنمونە کۆمەڵایەتییەکان ناتوانین ئەم کارە بکەین،باسەرنجێك لەتێڕوانینی کەسێکی وەك پییێر بۆردۆ بڕوانین، چۆن باس لەم دەسەڵاتە رەمزییە دەکات:رەسەدەکرێت، بۆ تێگەیشتن لەم بابەتە کارێکی ئاسان نییە هەروا بەنمونە کۆمەڵایەتییەکان ناتوانین ئەم کارە بکەین،باسەرنجێك لەتێڕوانینی کەسێکی وەك پییێر بۆردۆ بڕوانین، چۆن باس لەم دەسەڵاتە رەمزییە دەکات:رەسەدەکرێت، بۆ تێگەیشتن لەم بابەتە کارێکی ئاسان نییە هەروا بەنمونە کۆمەڵایەتییەکان ناتوانین ئەم کارە بکەین، ،باسەرنجێك لەتێڕوانینی کەسێکی وەك پییێر بۆردۆ بڕوانین، چۆن باس لەم دەسەڵاتە رەمزییە دەکات: چۆن بونیادی پەیوەندی تێگەیشتنی کۆمەڵایەتی بکەین، بەهۆی بەدحاڵیبوونەوە، یان بەدەر لەبەدحاڵیبوون، چۆن مامۆستاو قوتابی رێکدەکەون، لەڕێگەی جۆرێك لەتێگەیشتنی نائاشکرایی، بەشاراوەیی ئاراستە دەکرێت تاپێویست بکات، تیبێچون‌و رسك بۆ نزمترین ئاست کەم بکاتەوە، بۆ قبولکردنی پێناسی نزمترین ئاستی هەڵوێستی بەردەوامیپێدان(بۆردیۆ،2002 :206)، لێرەیەوە دەبینین بۆ زۆرێك لەو هۆکارانەی دەبنە هۆی پێکەوە ژیانی ئەی‌و



دووبوونەوەرەی کەمترین گونجانیان پێکەوە هەیە، بەڵام ئەو رێکەوتنە نائاشکرا کۆمەڵایەتییەی نێوانیان، ئەو پەیمانە نائاشکرایەی لەگەڵ بۆ بەردەوامیێتی‌و قبولکردن بەستویانە، دەبێتە هۆی ئەوەی چۆن یەکتری لەوپەڕی توندوتیژیدا قبوڵبکەین، لێرەدا مەبەست لەقبولکردنی ئەوی تر نییە، بەڵکو قبولکردنی توندوتیژییە، کەلەوەوە دەردەچێت، ئەمانە ئەو بنەمایان، کۆمەڵگا بۆ دانانی سانسۆرە خودیەکان سوودی لێوەردەگرێت، دەبێتە بەشێك لەو هێزەی دەتوانێت هەموو ناهەوسەنگیەکان رێکبخات‌و جۆرێك لەسستمی نوێی پێببەخشێت، ئەم کارە زۆرجار بەشێوەیەکی خۆبەخۆیی دەچێتە پێشەوە، بەبێ ئەوەی هیچ لایەکمان درك بەبوونی توندوتیژی بکەین، ئەو بوونیادە دەسەڵاتیە بەسەریەکەوە قبوڵدەکەین، واتە بەشێوەیەك لەشێوەکان دەچینە ژێر باری ئەوەی چۆن ئاکارو هەڵس‌و کەوتی رۆژانەمان دەخینە بەر ئەو گریمانەیەی ژیانی ئێمە توندوتیژی تێدا نییە، بەڵکو شێوازێکی سروشتی مومارەسەکردنی توندوتیژی تێدایە، دەتوانین بەوە پێناسەی بکەین، دەکەوێتە دەرەوەی تێگەیشتن لەتوندوتیژی، ئەو توندوتیژیە مۆدێرنەی ئەمڕۆ زۆرێك لەکۆمەڵگا کراوەکانی پێ تۆمەتبار دەکرێت.

تێگەیشتن لەتوندوتیژی دەسپێکی ئەو کارەیە، کەدەمانەوێت لەئێستا بەدوای بکەوین، ئێمەش هەوڵدەدەین لەناو پێکهاتەکانی خۆماندا توندوتیژی ناسی بکەین، تابزانین سەر بەچ جیهانێکین، ئایا ئێمەش لەناو کایە نوێیەکاندا بەدوای ئەو کارەدا دەگەڕێین؟، یان لەناو پێکهاتە نەریتیەکاندا توندوتیژی بەڕێوە دەبەین؟، ئێمە کام کارەیان ئەنجام دەدەین؟، هەموو ئەمانە وامان لێدەکەن بپرسین ئایا کۆمەڵگای

ئێمە پێویستی بەوە نییە هەنگاوێك لەناساینی ئەو دیاردانە نزیك ببێتەوە، کەپێیدەوترێت، توێژینەوەکردن، ئایا پێویستی بەستراتیژ نییە تابتوانێت لەمەودای کارەکانی نزیك ببێتەوە، ئەو مەودای کارکردنەی بەرەو کرانەوەی تەواوی دەبات، کەواتە دەکرێت پرسیار لەوە بکەین، توندوتیژی لەناو پێکهاتەی ئێمەدا خاوەنی کام پێناسەیە، بنەما کەلتوری‌و ترادسیۆنە کۆمەڵایەتی‌و تێگەیشتنە ئایینیەکان ئەم بوارەمان دەدەن، کارێکی لەو جۆرە بکەین، باتەماشای ئەو یەکە بچوکانە بکەین، کەلەناو کۆمەڵگاکانی ئێمەدا بوونی هەیە، ئەو یەکانەی خاوەنی پەیوەندییەکی تەواو دیسپلنن، هەر بیرکردنەوەیەك لەدەرەوەی ئەم خاڵە دەزانین بەرەو رووی چ کارەساتێکی گەورە دەبێتەوە، بەرەو رووی ئەوە دەبێتەوە ئێمە کارێك دەکەین دەمانەوێت بەر لەخۆمان بسڕینەوە، کەکارەکەی ئێمە رێك پێچەوانەی ئەم حاڵەتەیە، ئێمە دەمانەوێت هەموو مومارەسە توندوتیژەکان بخەینە ئەو شوێنەی کەدەمانەوێت کاری تێدا بکەین، کەدەمانەوێت بنەماکانی کارکردنی بدۆزینەوە، ئەم کارە لای ئەمان وادەکات هەست بکەن ئەو دەسەڵاتە رەمزییەی هەیانە بەرەو رووی گەورەترین شکستی مێژوویی دەبێتەوە، لێرەدا دەبێت ئەوەمان لاڕۆشن بێت، ئەم تێگەیشتنە خاوەنی هەندێك بنەمای تایبەتی خۆیەتی، خاوەنی جیهانبینی خۆیەتی لەبەر ئەوە ئاسان نییە هەروا بڵێین ئەمە تێگەیشتنێکە بۆ بەر لەتێزەکانی مۆدێرنە دەگەڕێتەوە، بۆ ئەمرۆمان نەشیاوە، راستە زۆر بنەمای ئەم کارە نەشیاوە بۆ رۆژگاری ئەمڕۆمان، بەڵام شیاوە بۆ ئەوەی بەرەنگاری یان کێشمەکێشی لەسەر درووست بکەین، ئەم کارە بەرەو دۆزینەوەی ئەو میکانیزمە دەمانبات



کەبۆ توندوتیژیناسی دەمانبات، لێرەدا ئەو پرسیارە دێتە پێشەوە: ئایا توندوتیژی تەنها دیاردەیەکە تاکو ئێمە بتوانین ئاماژەکانی بخوێینینەوەو لێیتێبگەین، یان توندوتیژی بەشێکی گەورەی لەنەستی ئێمە داگیر کردووەو بووەتە بەشێك لەنەریتی ژیانمان؟، ئێمە دەزانین هەموو دیاردەیەك هەڵگری کۆمەڵێك ئاماژەو سیمای تایبەتی خۆیەتی، بەڵام ناکرێت ئەوەمان بیربچێت توندوتیژی، لەهەموو هەنگاو هەڵسان‌و دانیشتن‌و هەڵس‌و کەوتێکماندا هەیە، ناکرێت ئێمە نکوڵی لەو کارە بکەین، لەبەر ئەوە بۆ ناساندی توندوتیژی ئەوەندەی پێویستمان بەوە هەیە بۆ ناخ‌و هەڵس‌و کەوتی تاك بگەڕێینەوە، ئەوەندە پێویستمان بەوە نییە، وەك مەسەلەیەکی تری بواری ژیان دیاردەناسی بۆ بکەین، لەبەر ئەوەی ئەوەندەی هەڵچونێکی دەروونی‌و کاردانەوەیەکی نەستە ئەوەندە مەسەلەیەکی بەرجەستە نییە، ئێمە لەکاتی جیاجیا لەشێوەی تردا بەرچاومان بکەوێت، ئێمە بەر لەئێستا باسمان لەتوندوتیژی رەمزی کرد، کەخاوەنی بەهایەکی پێوانەکراو نییە، چ جای ئەوەی بتوانین لەچوارچێوەیەکی دیاریکراودا بیناسینەوە.

یەکێك لەو بنەمایانەی دەبێتە هۆی فراوانکردنی توندوتیژی، ئەو بارە دەسەڵاتخوازەیە، کەلەناخی هەریەکەماندا بەئاشکرا هەوڵی کۆنترۆڵکردنی ئەویتر دەدات، ئەو بوارە دەتوانین لەناو کایەکانی ژیانی رۆژانەدا بەرچاومان بکەوێت، لەپەیوەندی نێوان مرۆڤەکاندا، لەچوارچێوەی ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەی ئێمە بۆ خۆمان درووست کردووە، وەك ئەوەی کاتێك ژن‌و مێردێك هەست دەکەن یەکتریان خۆش ناوێت، ئاستی تێگەیشتنی هەردووکیان چەند بێت، سەرەتاکانی

مومارەسەکردنی توندوتیژی لەچەندەها ئاستی مومارەسەکردنی ژیاندا سەرهەڵدەدات، لەوانەیە هەندێك جار ئازاری جەستەییش بەیەکتری بگەیەنن، لەبری ئەوەی بەشێوەیەکی ئەقڵانی بیر لەچارەسەری ئەو نەگونجانەیەن بکەنەوە، شێوازێکی تر کەزۆر نامرۆڤانەیە بۆ ژیانیان دەدۆزنەوە، بەو پەڕی هێزەوە مومارەسەی دەکەنو بەبێ ئەوەی هیچ جۆرە هەستێکی نامرۆیی لایان سەرهەڵبدات، راستە ئەمڕۆ لەکۆمەڵگا کراوەکاندا، سیماکانی کەسی توندوتیژیان دیاری کردووە، بەهەموو کەسێك ناوترێت توندوتیژ، بەڵام لای ئێمە مەسەلەکە شەقڵێکی تر وەردەگرێت، تاکوو هەنوکە هەندێك بنەمای توندوتیژی هەن ئێمە حسابی توندوتیژی بۆ ناکەین، بەڵکو وەك توندوتیژیش نایناسین، لەبەر ئەوەیە ئێمە باس لەوە دەکەین، کەتوندوتیژی لەکۆمەڵگای ئێمەدا ئەوەندەی نەریتە ئەوەندە مەسەلەیەك نییە ئەقڵانیەتێکی تایبەت بەڕێوەی بەرێت، ئەگەر شیاو بێت چەند نمونەیەکی ئەو جۆرە توندوتیژییە باس بکەینو بەئەقڵانیش وەرگیراوە، بگرە جۆرێك لەڕەوایەتی پێبەخشراوە، بریتیە لەو توندوتیژیەی نێوان مامۆستاو خوێندکار، لەوانەیە بپرسن لەناو ئەو هەموو جۆرە توندوتیژیەدا بۆ تەنها ئەم دوانە وەردەگرین، هۆکاری تایبەتیمان بۆ ئەم کارە هەیە، لەوانە، پەیوەندی ئەم دووانە پەیوەندیەکی مۆدێرنە، هەروەها لەناو دامەزراوەیەکی تەواو ئەقڵانیدا بەڕێوە دەچێت، ئەم دامەزراوەیە خاوەنی سستمی سانسۆری تایبەتی خۆیەتی، ئەمە جگە لەوەی خاوەنی بنەمایەکی تەواو سستماتیکە بۆ بەڕێوەبردنو ئامانجی دروستکردنی نەوەیەکە، جیاواز لەباوانی بیر بکاتەوە، بەڵام ئایا ئەم سستمە مۆدێرنە



توانیوویەتی ئەم کارە بکات؟، لەوانەیە لەسەر هەندێك ئاست ئەم کارەی ئەنجام دابێت، بەڵام ناکرێت ئەوەشمان بیر بچێت، ئەم سستمە لەناو کایەیەکی تەواو تەقلیدیدا هاتووەتە بوون، لەناو ئەو پێکهاتانەی دەوڵەت بنەماکانی شەرعیەت دان بەمومارەسەکردنی توندوتیژی بۆ داڕشتووە، هەروەها ئەو بنەمایانەی بۆ پەیوەندی نێوان مامۆستا خوێندکار داڕشتووە، لەبەر ئەوە ئاساییە، کەمامۆستا هەڵگری بەشێك لەو توندوتیژیە بێت، کەئێستا لەناو خوێندنگاکاندا مومارەسە دەکرێت، کاتێك ئێمە بیر لەوە دەکەینەوە سستمی پەروەردە بەدوور کەین لەمومارەسەکردنی توندوتیژی ئەمە بەتەنها بەبڕیارێك ناکرێت، پێویستی بەدامەزراوە هەیە ئەم کارە ئەنجام بدات، هەروەها پێویستە یاساکانی دەوڵەت لەهەموو ئەو مادانە پاکبکرێتەوە، کەڕێگە بەمومارەسەی توندوتیژی دەدەن، لێرەوە دەکرێت پەیوەندییەکی نوێ لەنێوان نەوەکاندا بێتە ئاراوە، کەلەسەر بنەمای یەکتریقبوڵکردنو مومارەسەکردنی ژیانی تایبەت پێك هاتبێت.

لێرەدا باس لەوە دەکەین، تاچەند پەیوەندیەکانی ئێمە لەسەر بنەمای جیاوازی دروست بووەو تاچەند مومارەسەی توندوتیژی تێدا دەکرێت، پەیوەندی لەسەر هەندێك ئاست وەردەگەرین، لەوانە پەیوەندی نێوان رەگەزەکان لەقۆناغە جیاجیاکانی پەیوەندیدا، پەیوەندی نێوان ژنو مێرد، پەیوەندی نێوان مامۆستاو خوێندکار لەهەموو قۆناغەکانی خوێندندا، پەیوەندی نێوان سەردەستو ژێردەستەکان، پەیوەندی نێوان دەسەڵاتو گەل، پەیوەندی نێوان هاوڵاتیو پۆلیسو زۆرێك لەپەیوەندیەکانی تریش، هەموو ئەمانە

خۆبەخۆ دەبن بەشێك لەبنەماكانی مومارەسەكردنی توندوتیژی، ئەمانە هەوڵدەدەن بەشێك لەبیری كۆنترۆڵكردن بۆ خۆیان پاوان بكەن، ئەم پەیوەندیانە هێشتا رەهەندە مرۆییەكەی خۆی بەتەواوەتی وەرنەگرتووە، هێشتا لەو قۆناغەدایە، ئەگەر هەوڵماندا ریتمی ژیان تێكنەدەین، ئەوا توندوتیژی خۆی حەشار دەداتو دەچێتە سوڕی متبوونەوە، بەڵام كاتێك بچوكترین نارەزایەتی بەدەر دەكەوێت یان بچوكترین كارێك ئەوان پێیان قبوڵ نەبێت، ئەوا بەوپەڕی وەحشیگەرییەوە دێتەوە مەیدان، ژمارەی ئەو كچانە كەم نین كەلەسەر پەیوەندیە مرۆییەكانی ناخیان تیرۆركراون، ژمارەی ئەو خوێندكارە دەستو سەر شكاوانە كەم نین، كەلەسەر بچوكترین جوڵانەوە مەرگیان پێنۆشراوە، كێ هەیە لەئێمە لەبەرامبەر دەسەڵاتدا خۆپیشاندان ساز بكات، نازانین لەبەر ئەوەی ئێمە هێشتا ئەمەمان تاقینەكردووەتەوە، بەڵام لەسەر كەلەوایەك مرۆڤێك تیرۆر دەكرێت، خوێندكارێكی زانكۆ لەبەرامبەر بچوكترین نارەزایەتیدا زیندان دەكرێت، ئەمانە هەرهەمووی ئەو نمونانەن، كەلەچركەی رووبەرووبوونەوەدا گوزارشت لەخۆیان دەكەن، باس لەوە دەكەن چۆن لادان لەهێڵە سوورەكانی ناو كایەی دەسەڵات، كارەساتی لێدەكەوێتەوە، ئەمانەن بیركردنەوەكانی ناو كایەی دەسەڵاتی ئێمە، ئەمانە ئەو بنەما كلتوریانەن، پێكهاتەكانی ژیانی ئێمەی لەسەر بونیاد نراوە، بەشێوەیەك وەك هەقیقەتی موتڵەقی لێهاتووە، بۆ ئەوەی باشتر لەكایەكانی توندوتیژی لەناو بیركردنەوەی خۆماندا بگەین، پێویستە بیر لەوە بكەینەوە چۆن ئەو بنەمایانەبدۆزینەوە، كەدەبنە سەرەتای دروستكردنی پەیوەندی، ئەو هێزانە كامانەن پەیوەندی



كۆنترۆڵو ئاراستە دەكەن، هەموو ئەمانە دەبن بەبەشێكی گرنگ لەو كارەی دەمانەوێت توندوتیژی تێدا پۆلێنو پێناسە بكەین.

یەكێك لەو مەسەلانەی ئەمڕۆ مشتو مڕی زۆری لەسەرەو بەشێكی بەرفراوانی توێژەرە كۆمەڵایەتیەكانی بەخۆیەوە خەریك كردووە، بریتیە لەتوندوتیژی خێزانی، بۆ ئەم مەسەلەیە سەرەتا لەو پرسیارەوە دەست پێدەكەین، ئایا توندوتیژی خێزانی سیفەتێكی مرۆڤانەیە، یان هەندێك لەبوونەوەرو ئاژەڵەكانی تریش لەم سیفەتەدا بەشدارن، ئایا ئەو توندوتیژیەی مرۆڤ پەیڕەوی لێدەكات، هەمان حاڵەتمان لەناو مەملەكەتی ئاژەڵیدا بەرچاو دەكەوێت؟، دیارە هیچ بوونەوەرێك وەك مرۆڤ توانا ئەقڵیەكانی لەو ئاستەدا نییە، بتوانێت بەو دیسپلینەی مرۆڤ بیر لەپێكهێنانی خێزان بكاتەوە، هەروەها خاوەنی هەمان ستراتیژیەتی بیركردنەوە نییە، كەمرۆڤ هەیەتی، لەبەر ئەوەی مرۆڤ خاوەنی خەسڵێتێكە، ستراتیژیەتی بۆ ناونان هەیە، هیچ ئاژەڵێكی تر ئەم خەسلێتەی نییە، ئەمە وامان لێدەكات بیرلەوە بكەینەوە، چۆن ببین بەخاوەنی ئەو بیركردنەوانەی چۆن سەرقاڵی رێكخستنی ژیان بین، لێرەدا تێژی تەمەلوككردن زۆر بەزەقی سەرهەڵدەدات، دواتر ئەمە دەبێتە پرۆسەیەك توندوتیژی لەسەر بەرزترین ئاست بەشداری تێدا دەكات، ئەقڵ لێرەدا وەك لەبیركردنەوەی ئایینیدا هاتووە رۆڵی شەیتان دەگێرێت، هەموو مومارەسەكانی توندوتیژی لەمەوە سەرچاوە دەگرن، ئەم كارە وامان لێدەكات بڵێین تەندوتیژی خێزانی تەنها سیفەتێكی مرۆییە بەبێ بەشداری هیچ بوونەوەرێكی تر، واتە ئەوە تەنها مرۆڤە بۆ كۆنترۆڵكردنی ئەوی مێینە پەنا بۆر ئەم كارە دەبات، ئەویش لەوەوە نا

جۆرێك لەخۆشەویستی لەنێوان ئەم مرۆڤانەدا هەیە، بەڵكو لەوەوە، ئەمانە هەڵگری ئەو نەخۆشیەن، دەتوانین پێیبڵێن، نێرسسیەت، یان ئەوەی هەست بكات بوونەوەرێكە لەوانی تر گەورەترە، بەڵام ئایا لەڕاستیدا وایە؟، یان ئەمە تەنها وەهمێكە لای خودی مرۆڤ بوونی هەیە؟، دیارە مەسەلەی بیركردنەوە لەمەسەلەكانی پەیوەندی مەسەلەیەكە تەنها بەخودی مرۆڤەكانەوە پەیوەستە، نەك بوونەوەرێكی تر، لەبەر ئەوەی بوونەوەرەكانی تر بێئایدۆلۆژیا ژیان بەسەر دەبەن، ئەوان خاوەنی مەزهەبێك نیین بۆ ئاراستەكردنو بابەتێكیان نییە بۆ پەرستن، ئەمە وادەكات مەسەلەی بوونی فەلسەفەیەك بۆ توندوتیژی مەسەلەیەكی مەحاڵ بێت. واتە تاكە بوونەوەرێك خاوەنی هێزی بیركردنەوەی توندوتیژی بێت، ئەوە مرۆڤە، لێرەدا دەكرێت ئەو پرسیارە بكەین بۆ؟.

### سەرچاوەكان:


ارندت، حنة، في العنف، ترجمة، ابراهيم العريس، دار الساقي، طبعة الاولى، 1992، بيروت

2-الربيعو، تركی علی، توندوتیژیو سێكسو پیرۆزی، لەمیتۆلۆژیای ئیسلامدا، وەرگێڕانی: ئاوات محەمەد، دەستنوس

3 -عبدالوهاب، ليلى، العنف العائلي، دار المدى، الطبعة الثانية، سنة 2000





4 - فرۆم، ئەریك، ئاینو شیكردنەوەی دەروونی، وەرگێڕانی ئاوات محەمەد، چاپی یەكەم، ساڵی 1999، سلێمانی

5- دلتاڤۆ، ئالیسا، توندوتیژی خێزانی، وەرگێڕانی ئاوات محەمەد، لەبڵاوكراوەكانی رێكخراوی ئاسوودە، چاپی یەكەم، 2002، سلێمانی

# ژن بەشداری سیاسی



سیاسە یەکێکە لەبوارە گرنگەکانی ژیانی مرۆڤ، چونکە ئەم لایەنەو ئەوکەسانەی کەلەم بوارەدا کاردەکەن، بەرپرسن لەڕێکخستنی ژیانی مەدەنیانەی مرۆڤ. گەرلێرەوە پێناسێکی کورت بۆهونەری سیاسەت بکەین.دەڵێن سیاسەت : بریتیە لەهونەری بەڕێوەبردن، مادامەکی سیاسەت هونەرەو پەیوەندیدارە بەبوارێکی گرنگی ژیان، کەئەویش ڕێکخستنەوەو ئاڕاستەکردنی کردنی کۆمەڵگایە لەژیانی سروشتی یەوە بۆژیانی مەدەنی، بەمانایەکی تر، ئاڕاستەکردنی ژیانە لەحاڵەتی ناسیستمیەوە بۆژیانی سیستم کراو بەبەرنامە بۆداڕێژراوو گۆڕانی کۆمەڵگایە لەژیانی نایاسایی‌و ڕێکخستنی بۆ ژیانی سیاسی‌و ڕێکخراو. لێرەوە (عەقڵ) یان ئاوەز، وەك بەشێك لەپێکهاتەی مرۆڤ بەشدارە لەڕێکخستنی ژیانی مرۆڤایەتی، لێرەوە دەمانەوێت شتێك بخەینە سەربەشداری ژن لەم بوارە گرنگەداو بزانین ئایا داخۆ ئەم بوارە گرنگە تەنها تایبەتە بەڕەگەزی ( نێر ) لەکۆمەڵگادا، یان ڕەگەزی ( مێ )، وەك بەشێك لەپێکهاتەی مرۆڤایەتی  بەشداری ئەم لایەنەگرنگەی ژیانی کردوە.

بۆدەرخستنی ئەم حاڵەتە پێویستمان بەگەشتێکە بەناو مێژووی مرۆڤایەتی دا بۆدەرخستنی ئەم حاڵەتە ئێمە پێویستمان بەوەیە کەلەو شوێنەوە دەست پێبکەین، کە هزر بەشدارە لەسەرلەنوێ داڕشتنەوەو ڕێکخستنەوەی ژیانی مرۆڤایەتی. دیارە سەرەتای ئەم حاڵەتەش  لەگەڵ سەرهەڵدانی فەلسەفەو گەشەکردنی فکری مرۆڤایەتی دەست پێدەکات، سەرهەڵدانی فەلسەفەو گەشەکردنی فیکر دەکرێت بگەڕێنینەوە سەر کەڵە فەیلەسوفانی یۆنانی ( سوقرات – ئەفلاتۆن – ئەرستۆ ) ڕاستە ئەم

سیٚ فەیلەسوفە لەگەلێك ڕووەوە خزمەتیان بەمرۆڤایەتی کردوەو هەریەکەیان خاوەنی چەندین بۆچوون و دنیابینی جیاوازبوون کەلێرەدا لەتوانادانیە کۆی بیروڕاکانیانی ئەوان سەبارەت بەژیان بخەینە روو، چونکە ئەوخاڵە گرنگەی کەئێمە دەمانەوێت گفتوگۆی لەسەربکەین لەبەین دەچێت و هەروەها بابەتەکەشمان بەئاڕاستەیەکی تەواو فەلسەفی دا دەڕوات، بۆیە ئێمە وابەباشمان زانی لەکۆی دیدو بۆچونەکانیان تەنها لایەنی سیاسی هەڵبژێرین، کەپەیوەستە بەبابەتەکەی خۆمانەوەو وەتاڕادەیەکیش هەرسێکیان کۆکن سەبارەت بەبەشداری ( ژن ) لەم بوارەدا کەسیاسەتە .

ئەوان پێیان وایە کەژن بەسروشت ( کەم عەقڵە )، واتە ئەم عەقڵە گەر مرۆڤـ بەسروشت، واتە هەر لەئەزەلەوە خاوەنی کەمیەك ( نقص ) بێت، ناتوانێت بێت لەسەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی کۆمەڵدا، چونکە سیاسەت ڕاستەو خۆ پەیوەستە بەعەقڵەوە ژنیش کەم عەقڵە کەواتە ئەو بەکەڵکی سیاسەت نایەت و دەبێت لەم بوارە گرنگەدا بیٚ بەشبکرێت. وەئەم بوارە بدرێتە دەست ڕەگەزە هزرمەندەکەی کۆمەڵگا کەپیاوە. ئەمانە زیاتر دەووری ژنانیان لەکاری ناوماڵ و پەروەردەی منداڵ و خزمەتی پیاودا کورتکردوەتەوە، دیارە ئەم حاڵەتە درێژە بەخۆی دەدات لەناو مێژووی فکری مرۆڤایەتی دا، ئەگەر لێرەوە بپەڕیتەوە بۆسەرهەڵدانی ئایین و پاشەکشە کردنی فەلسەفە. دەبینین ئاینیش بەتایبەت ئیسلام هەمان وێنای بۆ ژن هەیە. ئەویش ژن بەکەم عەقڵ سەربەگومان فریودەردەزانیٚ یەکەم دەزانێت و پیٚ وایە یەکەمین سەرپێچی کارلەفەرمانی خواوەند ژنە بەوەی کەئادەمی فریو داوە،



بەمەش ژن لەئیسلام دا تاوانبار سەرپێچی کارەو دەبێت سزبدرێت، بۆیە ئیسلام بەپێی دەستوری خۆی ژنی پلەیەك لەخوار پیاوەوە داناوەو هەمیشە، وەك گومانلێکراوێك سەیری دەکات پیاوی کردوە بەسەردارو سەرگەورەیی و بۆهەرناڕازی بونێك سزایەکی بۆداناوە. لێرەوە گەربچینە سەر فکری نویٚ و سەردەمی ڕۆشنگەری، هەمان حاڵەت خۆی دووبارە دەکاتەوە، ئەگەر سەری فکری ( جۆن لوك ) بکەین و وەك نموونە وەری بگرین هەمان تێزەکانی ( ئەرستۆ ) سەبارەت بەبەشداری ژن لەبواری سیاسەت دا دووبارەدەکاتەوە. ئەویش پێی وایە کەژن بەسروشت لەڕووی عەقڵیەوە نوقسانە، واتە کەم عەقڵە ئەم حاڵەتەش بەکەم ئەندامی دەچوێنرێت، بۆیە ژن بۆی نی یە بەشداری لەبوارە گرنگەکانی ژیاندابکات .

گەر بێینە سەرباروودۆخی بزوتنەوەو خەباتی سیاسی کۆمەڵگای کوردی دەبینین هەمان عەقڵیەت و بۆچون خۆی دووبارە دەکاتەوە، سەرەتا گەرلەخەباتی شاخەوە دەست پێبکەین دەبینین ئەم حاڵەتە تەنها پەیوەست بوو بەپیاوەوە .

گەرچی ژمارەیەکی زۆرلەژنان لەناو شارەکاندا بەشداریەکی بەرچاویان هەبووە لە بزوتنەوەی نهێنی شاردا، بەڵام کاتێك ئەوان شاریان جیٚ دەهێشت لەشاخ تەنها کاریان دەبوو بەخزمەتی پیاوەکان، لەگەڵ ئازاد کردنی کوردستان ودەست پێکردنی ژیانی شار ئەوان بواری سیاسی چ وەکو هەیکەلی ئیداری و بەڕێوەبردنی وولات چ لایەنی تیئوری، ئەم بوارەیان لەسەرخۆیان تاپۆکرد.

ئەوان پێیان وابوو مادامەکی ژنان بە شداری خەباتی شاخ‌و نەبەردی‌و پاڵە وانێتیەکانیان نەکردوە، نابێت لەوبوارەدا بەشداربن، ئەوان چیدی پۆستە گرنگە کانیان بەپێی لێهاتووی پسپۆڕی دابەش نەکرد، بەڵکو بەپێی بەشداری لە نەبەردیەکان دابەش کرد، بۆیە ژنان لەم قۆناغەشدا بێ بەش بوون لەسیاسەت‌و بەڕێوەبردنی ووڵات .

کۆتایی ئەم کورتە نووسینە بەوەدەهێنم کەژنان چیدی نابێت ئەوبوارە گرنگە بۆپیاوان چۆڵ بکەن‌و ڕۆڵی خۆیان تەنها لەناو ماڵدا بگێڕن ...



# دیموکراسیەت‌و پرسی ژن

هەڵبەتە بۆ ئەوەی لەچوارچێوەی دیموکراسی دا قسە لەپرسی ژنان بکەین، دەبێت سەرەتا خودی دیموکراسی بەجۆرێك قسەی لەسەربکرێ، دیمکراسیەت بەشێوە سادەکەی تەمەنی خۆی پتر لە ( 2500 ) ساڵ دەدات، ئەمەلەکاتێکدا ئەگەر برِیاربێت ئەوشێوەسادەیەی دیموکراسی لەیۆنانی کۆندا قەبوڵ بکەین کەتێیدا هەڵبژاردنو دیاری کردنی نوێنەران هەبووە، بەڵام بۆهەموو نەبوو تێیدا دەنگ بدەن بەتایبەتی ژنو کۆیلەو غەوارە، قسەلەوەش دەکرێت، جگە لەگریك لای میدیەکانیش هەڵبژاردن هەبووە، واتە شێوەیەك لەدیموکراسیەت. دیموکراسیەت بەسادەیی گەر پێناسەبکرێ، واتە دەسەلاتی خەڵك. ئەم پێناسەیە بەپێی بەرەوپێشچونی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی لەلایەكو بەپێی پێشکەوتنی سیاسەتی ولاتانو گۆڕانکاریە گەورەکان لەدەسەڵاتی خەڵکەوە پێناسەکەی درێژبوەوە بۆ پرسی ئازادیو هەڵبژاردنی یەکسانیو مل ملانێو ئاڵوگۆڕی دەسەڵاتو دادگەریو یەکسانی نێوان ڕەگەزەکانو هتد ...، ئەگەر هەرلەم شێوەیەشدا نەوەستاو لەماوەیەکی وورتردا دیموکراسیەت لەدنیادا فۆرمێکی ئاکاری وەرگرت، واتە پێوەرەکان لەسەر بنەمای دیموکراسی بوونو نەبوونی ولاتان کەوتە ژێر قسەو باسو ئیدی دەشێ لەپشت ئەمەشەوە هێندێك بەرژەوەندی خواز بەپێی خواستی خۆیان پێناسی دیکە بکەن، لەڕاستیدا دەکرێ سەدان پێناسەو فۆڕم بەپێی لێکدانەوە جیاوازەکان بدەینە دیموکراسی، بەڵام کەقسەدێتە سەر  کێشەی ژن لەو چوارچێوەیەدا. دەبینین سیستمی دیموکراسی لەکۆی میتۆدەکانی دیکە زیاترو جیاوازترە تەنانەت بەبیرو بڕوا ئایینیەکانیشەوە قسەی لەسەر پرسی ژن کردوە، بۆ نموونە



کەهەڵبژاردن دەبێتە پێوەری بنەڕەتیو دەستاودەست کردنی دەسەڵات، لەووڵاتە تازەکاندا کەدیکتاتۆریەت تێیاندا پەرچەمی زاڵە، ئیدی ناکرێت ڕۆڵی ژن لەومەسەلەیەدا بەهەند وەرنەگیرێت، هەرزوو لەبەریتانیا درك بەومەسەلەیە دەکرێو ئیدی بەدوای ئەویشدا ووڵاتانی دیکە چاوی لێدەکەن .

کەواتە ڕۆڵی ژنانو بەشداریان دواتر کارێکی گەورە دەکاتە سەرگۆڕینی دەمووچاوەکان، کەئەمەش روودەدات، ژنان نەك هەردەتوانن دەموچاوەکانی نوێنەرانو دەسەڵات بگۆڕن بگرە بۆخۆشیان دەبنە بەشێك لەدەسەڵات، وەك ئەوەی ئەمڕۆ لەخۆرئاوا بەشێوەیەکی بەرچاوتر لەدنیا بوونی هەیە، یان شێوەی پەرلەمانی سویدی بەنموونە .

هەڵبەتە قوڵکردنەوەی دیموکراسیو بەشداری لەهەڵبژاردن هۆشیاری زیاتر لەبارەی دیموکراسیو هەڵبژاردنەوە ڕۆڵێکی گەورە دەگێڕن لە گواستنەوەی ژنان لەچێشتخانەوە بۆ نێوهۆڵی پەرلەمان وپۆستە وەزاریەکان، بۆیە دەبێ ژنان شەڕێکی گەورە لەسەر دیموکراتیزەکردنی وڵاتەکانیان بکەن، ئێمە لێرەدا نابێت ئەوەشمان لەیاد بچێت هێندێك جار لەپەنای دیموکراسیەتەوە درێژە بەکاڵاکردنی ژنان دەدرێ، بۆیە جگە لەتێگەیشتن لەدیموکراسیو هەڵبژاردنو ئازادی، دەبێ ژنان پەرە بەهۆشیاری فراوانی خۆیان لەبارەی مافو بەرپرسیارێتیەوە لەو ڕوانگەیەوە، کەئێمە دەمانەوێت چ جۆرێك لەدیموکراسیەت ئاوابکەین، چ جۆرێك لەدیموکراسیەت بکەین بەپێوەر، لێرەوە مەسەلەی خود خاوەنی، یان خودێتی سەرهەڵدەدات وبەوپێیەی کەئایە ژنان کەبەشداری

پرۆسەی هەڵبژاردنو گۆڕان دەکەنو خوازیاری دیموکراسیەتن ئەوەخۆیانن ؟ .

لەئێستادا ئەو داواکاریانەو ڕێکخەرەکانی کەپیاوانە دەبێت ژنان چ سودێك وەرگرن جگەلەفریودانو بێمافیان، لێرەوە گەیشتن بەدیموکراسیەتی ڕاستەقینە، دیموکراسیەتی ئاکاری پێویستی بەجۆرێك لەقوربانی دانی ڕاستە قینە هەیە بۆ ژنان. قوربانی دان بۆقسەکردن لەسەر ماف وچارەنووسو ئازادیەکان. هەموو ئەمانەش دەبێ سەرەتایەکیان هەبێت، وەك چۆن سەرەتاکانی دیموکراسی بەشداری کردنو هەڵبژاردنو دیاری کردنی نوێنەرەو دواتر گۆڕینو یەکسانیو ڕێزگرتنو خۆشەویستیو لێبوردەییە. هەموو ئەم زاراوانە لەچوارچێوەی دیموکراسی دا شیکارو شیتەڵی زۆر هەڵدەگرن، ئێمە کە پێشتر قسەمان لەسەر ئەوەکرد کە دیموکراسیەت دواتر لەپێناسێکی بنەڕەتیدا دەبێتە مەسەلەیەکی ئاکاری کەم وێنە لەوڕوانگەیەوە بوو کەئیدی پرسەئاکاریەکان پەیوەستن بەقوڵکردنەوەی یەکسانیو پێکەوە ژیانو ڕێزگرتن لەیەکترو لێبوردەیی، بەمەش ئینسانی بوونی خۆمان لەچوارچێوەی دیموکراسی دا بۆدەگەڕێتەوە، کەواتە تەنها ڕێگایەك بۆئەوەی ژنان لێوەی هەناسەی ئازادانە بدەن ڕێگاری دیموکراسیەتە. ئەمە پەیوەندیەکی قوڵی بەپەروەردەو پەروەردەی خێزانیو پێشخستنی کۆمەڵگاو جوانکردنیە هەیە، ئەگەر ئەم بنەمایانە لەبەر چاونەگرین نابێ چاوەڕێی ژیانێکی تەندروست بکەین .

ژیانی تەندروست پەیوەندی بەوەوە هەیە چۆن بتوانین کۆمەڵگایەکی تەندروست دروست بکەین، بێگومان کۆمەڵگای تەندروست



حیزبی تەندروستو حکومەتی تەندروست ومرۆڤی تەندروستی تیادروست دەبێت .

هەڵبەتە بەبێ بوونی دیموکراسی ژن ناتوانێ دیوارەکانی دەسبەسەریو کۆیلەیی بڕوخێنێ، کەئەمەش نەکرا یەکسانیو دادگەریو هاوئاستی بوونی نیە، بێ بوونی ئەمانەش کۆمەڵگا ناتوانێ، وەهم چیرۆکی پاڵەوانێتی خۆی بگێڕێتەوە ...

# مافەکانی ژنو یاساکانی باری کەسێتی عێراقی ( قانون الحوال الشخصية )



کۆمەڵگای عێراق ،یەکێکەلەو کۆمەڵگایانە بەئەندازەیەکی زۆر پەیوەستە بەکەلتوری ئایینیەوەو ئەمەش لەدەسەڵاتو دەستوردا ڕەنگی داوەتەوەو بەسەر تاکەکاندا جێ بەجێ دەکرێو لادانیش لێ ی کارەسات دەخوڵقێنێ .

بۆیە قسەکردن لەسەر هەرلایەنێکی دەستور والەقەڵەم دەدرێت کەپیرۆزیەکانت شکاندبێت، لەگەڵ ئەوەی مێژووی یەکەمن دەستور لەعێراق دا زۆر کۆن نییە وە دەگەڕێتەوە بۆ بیستەکانی سەدەی بیست ودامەزراندنی یەکەمین دەوڵەتی عێراقی لەسەردەستی ئیستعماری بەریتانی. کەپێك هێنانی ئەو دوڵەتە لەسەربنەمای خێڵەکیو بەرژەوەندی خێڵایەتیو دواتریش ئایینی دامەزراو هیچ بەرژەوەندیەکی هاولاتیانو مافەکانیان لەبەرچاو نەگیرا، هەربۆیە عیراق بوە شوێنی مل ملانێی هۆز خێڵو ئەسنیکە جیاوازەکانو چەندین شەڕی ناوخۆیی لێکەوتەوەو شەڕەکانیش ناوەرۆکی جیاوازیان هەبوو هەم لەڕوی ئایینی یەوە هەم لەڕووی شێوازی مەزهەبیەوەو هەم لەڕووی تیرەگەریەوە. بۆیەکۆمەڵگای عێراق دوای دروست بوونی یەکەمین دەوڵەتی پاشایەتی تائیستاش عیراق دەستورێکی مەدەنی بەخۆیەوە نەبینیو بگرە ئینسانەکانی ئەم کۆمەڵگایە بەردەوام دوچاری ئازارو توندوتیژی بوون بەهۆی حوکمی عەشائیریو مەزهەبیەوە .وەژنان زۆرترین بەشی ئازارو توندوتیژیان بەرکەوتوە بەهۆی کەلتوری پیاوسالاریەوە کەهەمیشە ئەوکەلتورە سەیری ژنانی کردوە پلەیەك لەخوار پیاوەوە. ئەمەش وای کردوە بەردەوام ڕێگالەهەموو ئازادیەکانی ژنان بگیرێ بەناوی شەرف

پارێزیەوە، وەبەندەکانی دەستوریش هەرلەسەر ئەو بنەمایە دارێژراوە. بەشێك لەبەندەکانی دەستور کەتایبەتە بەبنەماکانی ڕێکخستنی پەیوەندیەکانی خێزان هاوسەرایەتی، لەبەرئەوەی سەرچاوەی لەشەریعەتەوە وەرگرتوە هەموو مافەکانی داوەتە دەست پیاوان، وەك ئەوەی پیاو بۆی هەیە چوار ژن بهێنێ‌و مافی تەڵاق بەدەست پیاوانەو دوانیان بەشاهیدێك لەدادگادا حساب دەکرێن‌و پیاو مافی لێدانی ژنی هەیە بەناوی تەمبێ کردن ... هتد. هەموو ئەوانە وای کردوە کەقامچی بداتە دەست پیاوان هەرکارێی ژنانی بەدڵ نەبێت ئەوابۆی هەیە تەمبێی بکات. چونکە ژنان هەمیشە بەشوین کاری خراپەوەن دەیانەوێت پیاوان فریوبدەن بۆکاری سێکس، بۆیەپیاوان مافی ئەوەیان هەیە کەژنان زنجیربکەن بۆئەوەی کاری خراپەنەکەن، ئەو ئازادی دانەبەپیاوان سەرچاوەی لەکەلتوری ئایینیەوە وەرگرتوەو بوەتەعەقڵیەت ولەدەستوردا رەسمیەتی پێدراوە. بۆیە دەبینین ژنان لەکۆمەڵگای عێراقی هەمشە دوچاری بێ مافی پێشێل کردنی سەرەتایی ترین مافەکانیان بوونەتەوە، سەرباری بوونی کەلتورێکی نێرسالاری، حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی عێراقیش بەردەوام کاری لەسەر سڕینەوەی کەسێتی ژنان کردوەو تەنها وەك کاڵایەك بۆمنداڵ بوون ولەزەتی سێکسی سەریری کردوون لەکۆی ماف ئازادیەکان بێ بەشی کردوون. بۆیە دەبینین ساڵانە ڕێژەی توندوتیژی دژی ژنان لەزیاد بوندایەو دەسەڵات ودەستوریش ڕۆژێك لەڕۆژان بیری لەوەنەکردوەتەوە بەربەو هەموو بێ مافیە بگرێت کەبەرامبەر بەژنان ئەنجام دەدرێت. بەڵکو هەمیشە لەهەوڵی زیندو کردنەوەی کۆنەپەرستی دابوەو کاری لەسەر ئەوەکردوە



کەبەردەوام بەربەپێشکەوتنی ژنان بگرێت کوتەك بداتەدەستی پیاوان‌و هەرچی ماف بڕیارو ئازادیەکی ژنان هەیە بیداتە پیاوان، بەمەش ژنان بێ بەش بوون لەسەرەتایی ترین ماف، کەئازادی هاوسەرگیری‌و خۆشەویستی یە. هەزاران کچ بەناوی شەرەف پارێزیەوە کوژران‌و دەسەڵاتیش کەم ترین سزای تاوان بارانی نەدا بەناوی کڕینەوەی شەرەفی خێزانەوە.

بەهەرحاڵ ژنانی کۆمەڵگای عێراقی لەبێمافی ترین ئاست دا ژیان دەگوزەرێنن‌و خەباتی ژنانیش بۆگۆڕینی بەندەکانی دەستور نەیتوانیوە کەمترین گۆڕانکار لەبەندەکانی دەستوردا بکات کەمێك ئازادی بەژنان ببەخشێ، بەدرێژایی دەسەڵاتەکانی عێراق هەتاپڕۆسەی ڕوخانی بەعس‌و لەبەریەك هەڵوەشانەوەی ئەو دەسەڵاتە دیکتاتۆرە، لەزۆربەی کاتەکان دا بۆناچارکردن پیاوان‌و ڕازی بوون بەملکەچی بۆدەسەلات، ژنانیان دەکردەوەسیلەی ملکەچ پێکردنی پیاوان، ئەوکردەوەیەش لەکۆی دەسەڵاتەکانی عێراق دا بوونی هەبوەو پیادەکراوە، هەرکاتێك پیاوێك دژی بڕیارەکانی دەسەڵات وەستابێتەوە بۆ ملکەچ پێکردنی یاخود ئیعتراف پێکردنی چون ژن، یاخود کچەکانیان هێناون‌و هەڕەشەی ئەوەیان لێکردن، ئەگەر ئیعتراف نەکەن ئەوا لەبەرچاوتان دەست درێژی دەکەینە سەریان. ئەمەش بەڕێژەی بەرچاو لەدەسەڵاتی بەعس دا جێ بەجێ دەکرا. بۆیەکەم نین ئەو ژن وکچانەی بەهۆی کەسوکاریانەوە دەست درێژی سێکسی ( اغتصاب ) کرایەسەریان‌و دوای ئازادبونیان لەلایەن کەسوکاریانەوە کوژران بەناوی شۆردنەوەی شەرەفەوەو دەستوریش کەمترین سزای بۆ ئەو کەسانە دانابوو، کە ژن، یاخود

کچەکانیان دەکوشت بەناوی شۆردنەوەی شەرەفی خێزانو بنەماڵە. بۆیە ژنان هەموو ڕێگایەکیان لێ گیرابوو بۆئەوەی بەئازادی هەناسەبدەن، بەڵکو بەردەوام لەچوارچێوەی ماڵەکاندا زیندانی کرابوونو هەموو بڕیارێك لەدەرەوەی ئیرادەو خواستی خۆیان دەدراو دەکرانە قوربانی، لەگەڵ ئەوەی بەشێك لەکۆمەڵگای عێراقی، کەهەرێمی کوردستانە ماوەی ( 12 ) ساڵ بەرلەڕوخانی بەعس لەژێر دەسەڵاتی دیکتاتۆری ڕزگاریان بوبو، بەڵام ژنانو مافەکانیان هەرلەشوینی خۆی مابوەوە، لەکاتێك دا ژنانی کورد بەڕێژەیەکی بەرچاو بەشداری خەبات وبەرەنگاریان لەدژی بەعس کردبوو، بەڵام دەسەڵاتی کوردی نەك کۆی ئەو بەندانەی هەڵنەوەشانەوە کەدژی مافەکانی ژنان بوو، بگرە بەشێك لەوئازادیەی ژنان کەبەهۆی هۆشاربوونەوەیان بەمافەکانیان لەڕێگەی بەشداری کردن لەخەباتی شۆڕش داو بەرزبوونەوەی ئاستی خوێندەوارو دروست کردنی چەندین ڕێکخراوی تایبەت بەخۆیان بۆ بەدەست هێنانی مافەکانیان، بەهۆی زیندوکردنەوەی فەرهەنگی کۆنەپەرستیو زیندووکردنەوەی عەشیرەتو بنەماڵەیی لێسەندرایەوە، چونکە پیاوان کەوتنە هەڕەشە لەژنان بەناوی ناموس پەرستیو کڕینەوەی شەرەفەوە چەندین ژنو کچ لەمافی ئازادی هاوسەری خۆشەویسی کرانو ڕەوانەی مەرگ کرانو دەسەڵاتی کوردیش کەمترین سزای تاوان بارانی نەدەداو تاوانبارانیش وەك بەرزەکی بانان بەبەرچاوی دەسەڵاتەوە دەسوڕانەوەو کوشتنی ژنان وکچانیش بوەچاولێکەری هەرباوکێك، یان براو ... هتد کەکارێکی بەدڵ نەبوایە بەبێ هیچ یەکودوویەك دەیکوشتن. ئەوکردەوەیە زیاترلەهەزار ژنو کچی کردە قوربانی دنیای کۆنەپەرستی حەزی پیاوانە. ئیستاش



دوای پڕۆسە گەورە ترین قوربانی دەستی تیرۆر وتوندوتیژی ژنان، لەگەڵ ئەوەی ئێستا هەرحیزبو گروپێك بۆجوان کردنی ڕووی خۆی چەندین ژنی هێناوەتە نێو ڕیزەکانی خۆییو قسە لەئازادیو مافەکانی ژنان دەکات، بەڵام هیچ یەکێك لەو گروپو حیزبانە کەدێتە سەرقسەکردنی جدی لەسەر مافەکانی ژنانو گۆڕانکاری لەبەندەکانی دەستورو دابین کردنی یەکسانی ڕەگەزی لەدەستوردا بەبێ جیاوازی، هەموویان دژی دەوەستنەوەو دەچنەوە سەرپلێتی ئەسڵی خۆیان، کەژن بەکەم عەقڵ زەعیفەو لەزەتی سێکسی دەزانن، بۆیەکاری ئێستای ژنان لەعێراق تێکۆشانە بۆگۆڕینی تەواوی ئەو بەندانەی دەستور کەپلەدووی یان دەسەلێنێو ئازادیەکانیان زەوت دەکات، ئەوکارەش بەبێ خەباتی چڕو پڕوهەمەلایەنەی تەواو ژنانی عێراقو ڕێکخراوەکانی ژنانو پیاوانی یەکسانی خواز نەبێت نایەتەدیو دەبێت ژنان هەرقوربانی دەستی ئارەزوەکانی پیاوبن ...



# بنەما گشتیەکانی مافی مرۆڤ و مافەمەدەنی وسیاسیەکانی ژنان...!



**پێشەکی**

ژنان بەدرێژایی مێژوو دوچاری گەورەترین چەوسانەوەهاتونو ئیستغلال کراون، وەبەتایبەتی ژنانی کورد توشی چەوسانەوەی کۆمەڵایەتیو فەرهەنگی هاتوون، بەهۆی گۆڕانکاری سیاسیو سەربازیەوە لەلایەن حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانەوە، بەدرێژایی زیاتر لە پەنجاساڵ کەبەردەوام هەوڵیان داوە بۆسەرکوت کردنی شورشی کوردو مافەنەتەوەییەکانی کورد. ژنانی کورد توانیویانە لەڕابوردودا دەوری خۆیان بگێڕنو کۆمەڵگا شانازیان پێوەبکات .

**دەسپێك.**

کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بەدرێژایی مێژوو ناڵاندیەتی بەدەست زوڵم زۆری کۆمەلایەتیو چەوساندنەوەی حکومەتە دیکتاتۆریەکانەوە، بۆیەگەلان بێبەش بوون لەسەرەتایی ترین مافەکانی ژیان هەتا مرۆڤایەتی گەیشت بەڕاگەیاندنی جاڕنامەی جیهانی مافەکانی مرۆڤ، کەپێك هاتبو لە ( 30 ) بەندو لەلایەن نەتەوەیەکگرتوەکان لەساڵی 1948 لەپاریس ڕاگەیەنرا .

ئامانجی ئەوڕاگەیاندنە بۆئەوە بوو کەکۆمەڵگای مرۆڤایەی بەهەندێك لەمافەکانی بگات، وەك ئازادیو دادپەروەریو ئاشتی لەدنیادا. بۆیەداوا لەهەموو حکومەتەکان کەهاوکاری یەکتری بکەن دەست بکەن بەجێ بەجێ کردنی بەندەکانی جاڕنامەی جیهانی مافەکانی مرۆڤـو لەنێو دەستوری وولاتەکانیان دا بیچەسپێنن‌و کاری پێبکەن‌و مومارەسەی بکەن، ئەمەش دەبێتە هۆکاری سەرەکی بۆئازادی بیروڕاو ڕەواندنەوەی ترسو دڵەڕاوکێ.

پەیماننامەی مافەکانی مرۆڤ لەبەندەکانی دا یەکسانی ژنو پیاوی چەسپاندوە، کەدیارە ئەوە ئەوسەرەتاگرنگەبوو بۆهەردووڕەگەز کەبتوانن بەبێ جیاوازی بێنە مەیدانی کۆمەڵایەتی ئاستی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگا بەرزبکەنەوە، بەشێکی بەرچاو لەبەندەکانی ئەوجاڕنامەیە تەکید لەسەر ئازادی مافەمەدەنیو سیاسیەکانی هەردوو ڕەگەز دەکاتەوە بەبێ جیاوازی ڕەگەزی، بۆنموونە هەردوو بەندی ( 3-21 )، وەهەردوو بەندی ( 22-27 ) تەکید لەسەرمافە ئابوریو کۆمەڵایەتیو ڕۆشنبیریەکان دەکاتەوەو هەوڵێکی زۆریان خستوەتە گەڕ بۆچاودێری کردنو جێ بەجێ کردنی ئەوبەندانە لە واقیعی کۆمەڵایەتیو ئابوریو ڕۆشنبیری، لەلایەن ئەودەوڵەتانە، بەڵام تائێستا لەزۆربەی وولاتان جێ بەجێ نەکراوە، سەڕەڕای ئەوهەوڵە بەردەوامانەی لەئارادان بۆجێ بەجێ کردنی بنەماکانی ئەم ڕاگەیاندنە جیهانیەی مافی مرۆڤ لەواقیعی کۆمەڵایەتیو ئابوریو ڕۆشنبیریدا لەلایەن وولاتانەوە لەچوارچیوەی یاساو پەیڕەوی ناوخۆی خۆیاندا، بەڵام هێشتا زۆربەی ئەو وولاتانە پابەندو دیلی بیری کۆن باوی کۆمەڵگەکەی خۆیانن، کەڕەگەزی بەشەریەتیان چەوساندوەتەوە لەژێر هەرخەربڕوبیانویەکدابێت، بەتایبەت چەوسانەوەی ژن کەبەش

شێریان بەرکەوتوەو تائێستاش جیاوازی لەنێوان هەردوو ڕوگەز بەشێوەیەکی بەردەوام لەپەرەسەندایەو بەپێی ئامارەکانیش دەرکەوتوەکە ژنانو ئافرەتان زۆرترین ڕێژەی چەوسانەوەی ئابوریو کۆمەڵایەتیان لەسەرەو ئەوەشی ئاشکراکردوەکە ژنان زۆرترین ڕێژەپێك دەهێنن لەچاو هەژارانی دنیاداو هاوکات ڕێژەی نەخوێندەواریش



هەرلەناو ئەو ڕەگەزەدایە، لەهەردوو کیشوەری ئاسیاو ئەفریقادا، ژنی کرێکار هەتانە (13) سەعات کاردەکەن زیاترلەوەی پیاوانو ژنان بەڕێژەی (30-40٪) کەمتر لەپیاوان لەکارکردندا، لەکاری یەکساندا دەخرێتەگەڕو بەڕێژەی (10-20٪) ی ژنان لەکاری کارگێڕیو کاروباری ڕێکوپێکی دا بەگەڕخراونو (20٪) کەمتریشیان لە کاروبارە پیشەییەکاندا بەگەڕخراون، ئەمەش مانای ئەوەیەکە چەوساندنەوەی ژنان لە هەمووبوارەکانی ژیانو ژیاریدا هێشتا بەردەوامەو درێژەی هەیەو چەمکی (یەکسانی) بەڕێژەکی قبوڵ کراو نەچەسپیوەو جێ بە جێ نەبووە. ئەوەی پێویستە بکرێت دەبێت هەوڵی زیاتر بدرێت بۆ بنبڕکردن جیاوازیەکانو ڕاگرتنی هاوهەنگی لەنێوان هەردوو ڕەگەزدا ئەمەش لەپێناوی ئەوەی کەژنانیش بەشیان هەیە لەمەسەلەی مافی مرڤـدا وەکو بنەمایەکی سەرەکیو ئامانجێکی کۆتایی، یان دوو ئامانج.

**نەتەوەیەکگرتوەکانو مافی ژن :**

دێپاچەی ڕێکەوتننامەی نەتەوەیەکگرتوەکان ئامانجێکی بنەڕەتی دیاری دەکات ئەوەش بڕواهێنانە بەمافەبنەڕەتیەکانی مرۆڤو یەکسانی لە مافی ژنان بنەماوئامانجی بنەڕەتیە، بەپێی مافەکانی یەکسانی ( نێرو مێ ) .

هەروەك لەبنەما سەرەکیەکانی ڕێکەوتنامەکە ئەوەیە کە نابێت هیچ جیاوازیەك هەبێت لە نێوان مرۆڤەکاندا بەهۆی ( ڕەگەز – دین – بیروڕای سیاسی )، هەرئەمەش بوو ( UN ) ی ناچارکرد کە پەیماننامەی نێو دەوڵەتی تایبەت بە ( مافە ئابووریو کۆمەڵایەتیو ڕۆشنبیری )

یەکانو پەیماننامەی تایبەت بە ( مافەمەدەنیو سیاسیەکان ) لەساڵی (1966) دەربکات.

هاوکات ساڵی (1979) ش پەیماننامەیەکی تایبەتی دەرکرد بەناوی ( ڕێکەوتننامەی بنبڕکردنی هەموو جۆرە جیاکاریەك دژی ژنان )، ئەمانەش جۆرێك لەپەیوەندیان پەیڕێ یاسا هێنایە ئاراوە کەتایبەت بن بەمافی ژنان.

**کۆتایی :**

جیاوازیە مێژوویيو ڕۆشنبیریيو مەزهەبیەکان ئەرکی دەوڵەتە کەمراعات وهەماهەنگی بکات بەچاوپۆشی لەسیستمی سیاسیو ئابوریو ڕۆشنبیریی، ئەمەش لەپێناوی گەشەپێدانو پاراستنی مافی مرۆڤدا، لەناویدا ( مافی ژن ) لەسایەی بارودۆخ وگۆڕانکاریە نێودەوڵەتیەکاندا کەبووە هۆی هەرەسهێنانی زۆربەی سیستمە سۆسیالیستیەکانو سەرهەڵدانی بیرۆکەی جیهانگیریو کارکردن بووە ڕێزگرتنی بنەما گشتیەکانی مافی مرۆڤ لە ( ئازادیو دیموکراسیو فرەیی ) .



# نەریتە کۆمەڵایەتیە خراپەکانو پێشێلکردنی مافەکانی ژنان ...!

کۆمەڵگای کوردیش، وەکو سەرجەم کۆمەڵگاکانی تری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست تاوەکوئێستا لەکەلتوری خۆیدا بەسەدان دیاردەی کۆمەلایەتی دواکەوتووو دزێوی تێدایە، کەبوونەتە ئاستەنگ لەبەردەم پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی، فکری، کەلتوری، مەعریفی ئەوکۆمەڵگایە دا .

ئەودیاردانەش بێگومان زۆرجار کارەساتو مەینەتی زۆری لێکەوتوەتەوەو هەندێك جار لەپەنای شەرعیەت دان بەو دیاردانە کاری زۆر دڕندانەو بەربەریانە بەرامبەر بەتاکی ئەم کۆمەڵگایە کراوە، هەر لەئازادی جەستەیی یە وە تاکو بەئەتککردن دەگات، زۆرجاریش بەکوشتن کۆتایی هاتووەو بەردەوامیش ئەوتوندوتیژیانە ئاڕاستەی ڕەگەزی مێینە کراوەو هەرئەوانیش قوربانی ئەو دیاردانە بوونو باجەکەیان داوە، بێگومان هیچ کۆمەڵگایەك لەجیهاندا ناتوانێ پەرەسەندنو پێشکەوتنی سیاسیو ئابوریو کەلتوری بکات، ئەگەر شانبەشانی ئەوانەش پێشکەوتنو پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی ئەنجام نەداتو لەکۆمەڵگایەکی دواکەوتوی داخراوەوە خۆی نەگۆڕێت بۆکۆمەڵگایەکی مەدەنیو کراوە لەسەر بنەمای پرنسیپەکانی مافی مرۆڤـو ئازادی ڕادەربڕین، بۆئەوەی زیاتریش بابەتەکە ڕوونبکەینەوە بێگومان دەبێت ئاماژە بەهەندێ لەو دیاردە دزێوانە بکەین، کەتاوەکو ئێستاش لەناو فەرهەنگی کوردیدا بوونی هەیەو لەناوچەیەکەوە بۆناوچەیەکی دەگۆڕێتو جیاوازی هەیەو چەوسانەوەکان جیاوازن، ئەودیاردانە هەندێکیان لەخوارەوە دەست نیشان دەکەین .

1- ژن بە ژن
2- ژن دان لەبری خوێن



3- گەورە بە بچوك
4- تەماشا کردنی ژن وەك کەسێکی لاوازو بێ عەقڵ
5- دروستکردنی ناو ناتۆرەی ناشرین بەرامبەر بە ژن
6- ئەتککردنی ژن
7- سەیرکردنی ژن وەکو ئامێرێك کەتەنها ئەرکی دروستکردنو بەخێوکردنی منداڵو هیچی تر.

هەریەك لەودیاردانەش پێوستی بەڕونکردنەوەی زیاترهەیە .

**دیاردەی ژن بەژن :**

وەك دیاردەیەکی ڕیشە قوڵو خاوەن مێژوویەکی دوورو درێژ لەناوکەلتوری کوردەواری دا تاوەکو ئەمڕۆ بوونی هەیە. لەم حاڵەتەشدا مرۆڤەکان ( کچەکان ) دەگۆڕدرێنەوە بەبێ لەبەرچاوگرتنی هیچ بەهایەك بۆمرۆڤەکان، بێگومان ئەم کارەش لەلایەن پیاوانی خاوەن دەسەلاتی خێزانەوە ( باوك، برا، مام، خاڵ ) وە ئەنجام دەدرێتو هیچ پرسو ڕایەکیش بەمرۆڤەکان ناکرێتو بیانەوێت ونەیانەوێت دەبێت بڕیاری پیاوانی خێزان قبوڵ بکەنو بەردەوامیش ئەم جۆرە حاڵەتانە ئەنجامی نەگەتیڤی دەبێتو زۆرجار کارەساتی لێدەکەوێتەوە، چونکە محاڵە دوو ژن لەیەك کاتدا هەمان بیرو بۆچونیان هەبێت، زۆرجار بینیومانە لایەکی خێزانەکە زۆرتەباو ڕێکوپێکو گونجاون، بەڵام لایەکەی تر ناگونجێنو لەم حاڵەتەشدا کێشەدەکەوێتە نێوان خێزانەکەی تریشو دوای بێنەو بەردەیەکی زۆر کێشەی جیابونەوە دەکەوێتەنێوانیان ( تەڵاق ).

## ژن دان لەبری خوێن :

ژن دان لەبری خوێن ئەمەكارێكی دڕندانەی تری كۆمەڵگای كوردیە لەبەرامبەر ژناندا، كەپیاوان هەڵدەستن بەئەنجام دانی ئینسان كوژیو دواتر باجەكەی دەبێت ژنان بیداتو ببنە قوربانی ئارەزوەكانی پیاوانو تاوانكاریەكانی، بۆنموونە زۆرجار لەسەر شتێكی زور پوچ، یان كێشەیەكی ئابوری، یان كۆمەڵایەتی كەسێك دەكوژن. بەڵام دواجار بۆ كوژاندنەوەی خوێن، ئەودوژمانە هەڵدەستن بەپێدانی ژنێك بۆكۆتایهێنان بەكێشەی دوژمنایەتی، لەوحاڵەتەدا هیچ حسابێك لەسەر ئەو ژنەناكرێت كەدەدرێت بەدوژمنەكان كەلەچ ئاستێك دا ژیان بەسەردەباتو چۆن هیواو خۆزگەكانی دەكەن بەژێرگڵەوەو دوچاری گەورەترین ڕۆژ ڕەشی دەكەن. چونكە بەردەوام ماڵی كوژراوەكە وەك دوژمن سەیری دەكەن ڕقیان لێ دەبێتەوە، یان وەكو كورد دەڵێت ( برا كوشتە سەیری ) دەكەن،

## گەورە بەبچوک :

ئەم دیاردەیەش یەكێكە لەو دیاردە دەگمەنانەی كەتەنها لەناو كۆمەڵگایەكی دواكەوتودا جێ دەبێتەوە، ئەگەرنا هەرگیز ناكرێت دوومرۆڤ، جیاواز لەتەمەنداو لەبیركردنەوەو دوارۆژدا ئاڵوگۆڕپێبكرێت، ئەم دیاردەیەش بەردەوام كێشەی زۆری دروست كردووە، چونكە جیاوازی تەمەن لەنێوان ئەودووكەسەدا كەئاڵوگۆڕیان پێدەكرێت بەردەوام لە ( 15-10 ) ساڵ كەمترنیە، پاشان كچی بچوك كەگەورە دەبێت زۆرجار



بیروبۆچونەكانی دەگۆڕێت، چی ماڵی كچە بەرامبەر بەكوڕەكە یاخود بەپێچەوانەوە، بۆیە كێشەی لێ دەكەوێتەوەو بەردەوامیش باجی چارەسەرەكەی لەسەر كچەكە دەكەوێتەوەو زۆرجاریش چارەنووسی دەبەسترێتەوە بەبڕێك پارەی زۆرەوە. ئەمەش وادەكات كەكەس ئامادەنەبێت بڕێكی زۆر پارەبدات بۆ خواستنی ئەویش دوچاری قەیرەیی دەبێتو لەشوكردنو ژیانی هاوبەشی خێزانی بێبەش دەبێت.

## تەماشاكردنی ژن وەكو كەسێكی لاوازو بێ عەقڵ :

بەردەوام لە كۆمەڵگا دواكەوتوەكاندا ژن وەكو مرۆڤێكی لاوازو بێ عەقڵ سەیردەكرێت، ئەوەش زیاتر هەڵسەنگاندنێكە لەڕووی جەستەییەوەو دەدرێتە پاڵ ژنان، چونكە ژنان خاوەنی هەمان بەهێزی ماسولكەیی نین، بۆیە ژنان بەردەوام وەكو بونەوەرێكی لاوازو بێ دەسەڵات سەیردەكرێن. ئەم تێڕوانینەش وایكردوە ژنان هیچ ڕۆڵێكی گرنگیان پێ نەدرێتو بەردەوام پەراوێز بكرێن ,

## دروستكردنی ناوناتۆرەی ناشرین بەرامبەر ژنان :

ئەوناوناتۆرە ناشرینانەی كەدەدرێنە پاڵ ژنان، بێگومان ئەویش لەو تێڕوانینە خراپەوە سەرچاوەی گرتوە، كەكۆمەڵگا بەرامبەر بەژنان هەیەتی , دەكرێت لێرەشدا چەند نموونەیەك بهێنینەوە لەو ناوناتۆرانەی دژی ژنان بەكاردەهێنرێت، وەك ( ژن عەقڵی لەكۆشیایەتی كەهەستا دەكەوێتە خوارەوە، ژن شەیتانە، ژن نیوە عەقڵە، هەرچی

کێشەی دنیاهەیە لەپشتی ژنەوەیە، دەڵە سەگ، دەڵە قۆڕ، سەرت بتاشن، زەعیفە، سۆزانی، چەنەباز ... هتد ).

## ئەتککردنی ژنان :

بێگومان ئەم دیاردەیەش لەکۆمەڵگا دواکەوتوەکاندا بەردەوام هانای بۆ براوە بۆتۆڵە کردنەوە لەوژنانەی کەسەر پێچی فەرمانی گەورەکانیان دەکەن وەك ( باوك، برا، مام، خاڵ ... هتد )و ویستویانە لەدابو نەرێتی خێڵایەتی یاخی بین، وەك ( بەشودانی زۆرە ملێ، گەورە بەبچوك، ژن لەبری خوێن، ژن بەژن )، هەرگیز نەچنە ژێر باری ئەوکارەوەو واقیعێکی نوێ بخولقێنن، بۆیە ئەم یاخی بوونە هەمیشە بەخوێن کۆتایی هاتوەو بەردەوامیش ژنان بوونەتەقوربانی، زۆرجاریش ژنان توشی لێدانو دەستو قاچ شکان بوون، تائەندازەی سەرتاشینو ئەتککردنو حەیابردنو لوت بڕینو گوێ بڕینو دوالوتکەش کوشتن، هەرچەندە ئەم دیام دیاردەیە لەزۆر ناوچەی کوردستان درێژەی هەیەو بەشێوازی جیاواز پەرەی پێدەدرێتو بوونی هەرماوە.

## سەیرکردنی ژن وەک ئامێرێک بۆمناڵ بوونو بەخێوکردنی :

ژن لەکۆمەڵگای ئێمەدا بەردەوام وەکو ئامێرێك (( سەیرکراوەو هەرلەو تێڕوانینەشەوە هەڵسەنگێنراوە، بۆیەبەردەوام ئەو ژنانەی ڕێزی زیاتریان لێگیراوە کەمنداڵی زیاتریان ((بەتایبەت کوڕ )) دەخەنەوەو ژیانی خۆشیان بەگشتی تەرخان دەکەن بۆ بەخێو کردنی ئەوژمارە زۆرەی منداڵ، کەئیتر ژنەبواری ئەوەی نامێنێ بیرلەهیچ شتێك بکاتەوە،



جگە لەکارکردنو بەخێوکردنی مناڵان، لێرەوەش ووردە ووردە ئەوئینسانە خولیاو ئارەزووەکانی لەدەست دەداتو دەبێتە کۆیلەیەکی زۆرباشی پیاوو زنجیری کۆیلایەتی دەکرێتە تەوقی گەردنیو چارەنوسی بەنادیار دەسپێردرێت ...

